یەکەمین گۆڤاری کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی لە کوردستاندا

مانگنامەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی



ساڵی دووەم
14
تەمموزی
2009



# دیموکراسی و هەڵوێستەیەك!!

## تۆی یاخی دەتەوێت چی بکەیت؟!



# یاسایەکی سەیر بۆ هەڵبژاردن!

## کێ دەیەوێت ببێتە سەرکردە؟!



## ژمارە 13 کێشەیەکی گەورە دەنێتەوە!

## کەس پێشەوای درۆزنی خۆشناوێت!






بۆ ژیانێکی ئاسوودە
بۆجیهانێکی
پڕ لەمیهرو
خۆشەویستی
لەم ڕۆژگارە دژوارەدا
بریارهەڵبژێرە!!

بۆ ئایندەیەکی ڕوون
با بریار هەمیشە هاوڕێتان بێت!!

بۆ ئەوەی دەستت هەبێت لە گۆڕانی کۆمەڵگادا
بۆ ئەوەی ئاراستەی تاکەکانی کۆمەڵگا بکەیت
بەرەو گۆڕان و پێشکەوتن و سەرکەوتن

مانگانە بە گۆڤاری بریار خۆشەویستان و ئازیزانت

بەسەر بکەرەوە!!

***نرخی بەشداری ساڵێک 12 ژمارە 30000 دینار***

***نرخی بەشداری دوو ساڵ 24 ژمارە 55000 دینار***

The first Magazin Especializined in Management and Human Development in Kurdistan

# بڕیار

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی
سالی دووەم – ژمارە 14 - تەمموزی 2009

























**بۆ پەیوەندیکردن بە بڕیارەوە**

کەرکوك: ٠٧٧٠٨٥٦٣٧٢٤ هەڵەبجە: ٠٧٧٠١٩٣٣٩٦٧ ٠٧٥٠١١٢٩٤٣٧
دەربەندیخان: ٠٧٧٠١٥٨١٠١٨ کفری: ٠٧٧٠١٥٦٦٨٧٦ کەلار: ٠٧٧٠٢١٠١٢٨٨
چەمچەماڵ: ٠٧٧٠٨٥٥٠٥٨٦ کۆیە: ٠٧٧٠١٥٤٩٧١٤ سۆران: ٠٧٥٠٤٥٠١٩٣٣
چۆمان: ٠٧٥٠٤٥٦٧٩٩٢ قەڵادزێ: ٠٧٧٠١٥٨٥٢٠١ رانیە: ٠٧٧٠٢٢٩٣٦٢٨

تیراژ: ٣٠٠٠ دانە

چاپخانەی سەردەم

**خاوەنی ئیمتیاز**

ئەندازیار مەسعود تاهیر رۆژبەیانی

**سەرنووسەر**

عادل محەمەد شێخانی

sarnosar@yahoo.com
07705033131

**پەیوەندییەکان**

محەمەد هاشم

بەرزان ئەبوبەکر

**دیزاین**

جەمال دەروێش

قەیدار رەحیم

## مەرجەکانی بڵاوکردنەوە

داوا لە هەموو ئەو ئازیزانە دەکەین کە بابەت بۆ گۆڤارەکەمان دەنێرن رەچاوی ئەم خاڵانە بکەن بە پێچەوانەوە هەر نووسینێك ئەم خاڵانە رەچاو نەکات پشتگوێ دەخرێت.

١- نابێت لە نیو لاپەڕەی (A٤) بە فۆنتی (١٢) کەمتر بێ و لە دوو لاپەڕەش زیاتر بێت.

٢- دەبێت ئاماژە بە سەرچاوە بکرێت لە هەر دوو حاڵەتی وەرگێڕان و نووسیندا.

٣- دەبێت ناو یان نازناو بنووسرێت، نازناوی باوك یان دایك پەسەند نییەو هیچ بابەتێك لێرە بە دواوە بەو نازناوە بڵاوناکرێتەوە.

٤- بابەتەکە بە ئیمێل بنێردرێت و ژمارەی مۆبایلی لەسەر بێت.

٥- ئەو بابەتە یەکەمجار بێت بڵاو بکرێتەوەو پێشتر لە هیچ گۆڤارو رۆژنامەیەکی تردا بڵاو نەکرابێتەوە.

**ناونیشانی گۆڤار**

سلێمانی- شەقامی سالم- تەلاری سلێمانی مۆڵ، نهۆمی/2
بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردە
07702178682 3193946
E-mail: bryarmagazin@gmail.com
هەولێر- شەقامی گوڵان بەرامبەر دەزگای ئاراس
07504463230 07507658535
0662559165

کاتێک هێزو
دەسەڵاتت هەیە
بەزەییت لە
بیرنەچێت!
چونکە کاتێک
دەسەڵاتیشت نەما
خەڵکی بەزەیی
تۆیان هەرگیز
لە بیر ناچێت!!

## یەکەم دڵۆپ

# دیموکراسی و هەڵوێستەیەک!!

ئەگەر پێش (١٠ - ١٥) ساڵ لەمەوبەر لەم وڵاتەی ئێمەدا بە هەر کەسێکت گوتبا کە خواردنی گۆشتو چەوری زیان بە تەندروستیت دەگەیەنێت، زۆر بە توندی بەرپەرچی دەدایتەوەو لەوانەیە تووشی کێشەی گەورەش بهاتبای! بەڵام ئێستا کەس نکولی لەوە ناکات، لە کاتێکدا ئەو زانیارییە نوێ نییەو، ئەگەر لای ئێمە نامۆ بووبێت ئەوا لە زووەوە خەلکی لە زۆربەی وڵاتانی جیهاندا ئەو حەقیقەتە دەزانن.

ئەمڕۆش خەلکی وڵاتی مە وەکو سیستەمێکی نموونەیی تەماشای دیموکراسی دەکەن، پێیان قبوڵ ناکرێت ڕەخنەو گازندەی لێ بگیرێت، لە کاتێکدا ئەو ڕەخنانەی ئاراستەی دیموکراسی کراوە کۆنن و لە مێژە فەیلەسووف و بیرمەندەکان ڕەخنەو توانجی خۆیان ئاراستەی دیموکراسی کردووەو گومانی خۆیان دەربریوە سەبارەت بە گونجاوی ئەم سیستەمە بۆ ژیانی مرۆڤایەتی.

هەر لە زەمانی سوقراتو ئەفلاتۆنەوە تا زەمانی مارکس، سیستەمی دیموکراسی بە حوکمی (گێرەشێوێنی) ناوزەد کراوە، ئەم وتەیەش شتێکی مەنتیقییە، چونکە زۆرینەی گەل لە هەموو وڵاتانی جیهاندا کەمینەی ڕۆشنبیرو زیرەکو دانا پێکدەهێنن و لە کاتی هەڵبژاردنو پرۆسەی دیموکراسیدا بە هۆی پروپاگەندەو بەرتیلو بەخشیشو خەڵاتو واڵدەو پەیمانی چەورەوە، دەکرێت بە ئاسانی لە خشتە ببرێن. هەر بەو سیستەمەش ئەلمان هیتلەریان هەڵبژاردو ئەمریکییەکانیش ئال بۆشیان هەڵبژاردو فەزلی ڕۆنالد ریگنیان دا بەسەر کارتەردا.

(ئەفلاتۆن و ئەرستۆو یوربیدس و ئیسوکراتیس) لایان وایە کە لە سیستەمی دیموکراتیدا خەلکی بە پێی هەواو ئارەزووی خۆیان دەژین و جلەو بۆ ئازادی بێ سنووری خۆیان شل دەکەن، با پێچەوانەش بێت بە بەها کۆمەلایەتی و ئاکارە بەرزو چەسپاوەکان!

بنیامین کونسان دەڵێت: "ئەم ڕێبازە دەمانبات بەرەو ڕێگایەکی ترسناک، کە ئەویش خۆسەپاندنی چەوسێنەرانەی پەرلەمانە"

بارسمیش دەڵێت: "بنەمای دیموکراسی وا دەکات، بانگەشەی ئەوە بکات کە دەسەڵات هەمیشە لەسەر حەقە، چونکە لە ویستی گەلەوە سەرچاوەی وەرگرتووە، بەو مانایەی کە ئەندامانی پەرلەمان نوێنەری میللەتن و هەرکارێکیش میللەت ڕای لەسەر بێت هەماهەنگە لەگەڵ حەقو دادگەریداو قابیل بە گفتوگۆ لەسەرکردن نییە، ئەم بنەمایەش سیفەتی "عیسمەت" دەدات بە گەلو نوێنەرانی و گەل بەرەو دیکتاتۆریەتو خۆسەپاندن دەبات، چونکە ئەوەی ئەوان دەیلێن ویستی گەلەو لە ڕووی یاساییشەوە دەتوانن هەموو کارێک ئەنجام بدەن".

ئەگەر ئاورێکی خێرا بدەینەوە بۆ دواوەو تەماشای مێژووی سەرهەلدانی دیموکراسی بکەین، دەبینین کە یەکەم جار لە مێژوودا ئیغریقییەکان لە دوو شاری (ئەسیناو ئەسبرتەدا ) پیادەیان کردووە، کە لە هەردوو شارەکەدا حکومەتێک بە ناوی "حکومەتی شار" هەبووە، کە تیایدا هەموو تاکەکانی کۆمەڵ لە پیاوان بەشدارییان دەکرد لە حوکمرانی شاردا، خەلکی شار لە شێوەی کۆمەلەیەکی گشتیدا راگۆرینەوەیان دەکرد سەبارەت بە کاروباری حوکمو سەرۆکیان هەلدەبژاردو یاسایان دەردەکردو سەرپەرشتی جێبەجێکردنیان دەکردو سزایان بۆ سەرپێچی دیاری دەکرد، دەتوانین بلێین: جۆری یەکەمی دیموکراسی کە بە دیموکراسی ڕاستەوخۆ ناودەبرێت بە تەواوی لەم دوو حکومەتەدا پیادە دەکران، بەڵام ئەم شێوەی دیموکراسیەتە بە نەمانی حکومەتی شار کۆتایی پێهاتو نەما.

دواتر حوکمی دەرەبەگیو ستەمو دیکتاتۆرییەت لە سێبەری ئیمپراتۆریەتی رۆمانیدا (دوو هەزار ساڵ) ئەورووپای داگرت، شۆڕشی گەلانی ئەورووپاش توانی سەرکەوێت بەسەر دیکتاتۆریەتو دەرەبەگیداو شیاوترین سیستەم کە دوایی لەسەری پێکهاتن گەرانەوە بوو بۆ سیستەمی دیموکراتی، چونکە جگە لەو سیستەمە هیچ ڕێگەچارەیەکی تریان لە بەردەمدا نەبوو، وەلێ دواتر بە ئاشکرا دەرکەوت کە دیموکراسیەت بوو بە نێوەندێک بۆ دروستکردنی هەماهەنگی لە نێوان چینی سەرمایەدارو چینی هەژاردا، کە داوای ئازادیو یەکسانی دەکات، تا نووسینی ئەم چەند دێرەش حوکمو دەسەڵات لەو وڵاتە دیموکراسیانەدا لە دەستی چەند پارتو کەسایەتییەکی چینی سەرمایەداردا دەرنەچووەو دەستکەوتی گەلیش تەنها سندوقی دەنگدانو ئازادییەکی ڕەهایە کە زۆر بە سلبی شکاوەتەوە لەسەر ئاستی ئەخلاقیو ئابووریو گوزەرانیان.

دیموکراسیەت بە ئاشکرا بووەتە داردەستی سەرمایەداریو سەرمایەدارانو چۆن بیانەوێت ئاراستەی ڕەوتی دیموکراسی دەکەنو هەرکەسێك دەسەڵاتو پارەو پارتێکی سیاسی لە پشتەوە نەبێت ئەستەمە بتوانێت بیر لە گومەزی پەرلەمان بکاتەوە. بۆ ئەم مەبەستەش هەموو شێوازێکی نامەشروع دەگیرێتە بەرو ڕاگەیاندنو ڕۆژنامەگەری بە نێو ئازاد دەزانێت چۆن کێشەکان دەوروژێنێت!!

لە هیچ وڵاتێکی دنیاشدا بە هەلبژاردنێکی ئازادی بێگەرد، هیچ سەرۆکێك یاخود هیچ پارتێك بە زۆرینەیەکی زۆر نەیتوانیوە بگاتە کورسی دەسەڵاتو لە بەرامبەردا مافی کەسانێکی زۆر پێشێل دەکرێت، کە هەندێك جار ٤٥٪ی دەنگدەران پێکدەهێنن، ئەگەر ئەمە حالی دیموکراسی بێت لە نێو جەرگەی وڵاتانی دیموکراسیدا، ئەوا لە وڵاتی ئێمەدا لەو یارییە زیاتر نییە، کە کاتی خۆی (چەرچل) گوتی: میسریەکانی پێوە بخافلێنن!!

لەبەرئەوە نابێت چاوەڕێی شتی زۆر گەورە لەم سیستەمە بکرێت، لە کاتێکدا کە لە ناو ئێمەدا نامۆیەو لە ئاستی فیکریو ڕۆشنبیریو پەروەردەیی سیاسەتمەدارانەوە زۆر دوورە، ئەورووپای دیموکراسیش قوربانیو تێکۆشانو ماندووبوونی زۆری چەشت تا کۆمەلگای دەرەبەگی گۆری بە دیموکراسی.

دیموکراسی تەنها کراسێك نییە بتوانیت لەبەری بکەیتو بەس، بەلکو ڕۆشنبیریو مومارەسەو پەیوەستبوونە بە بنەماکانیەوە، لە کاتێکدا بۆ گەیشتن بەو مەبەستە ماندووبوونو هەولدانو تێکۆشانێکی زۆری دەوێتو ئێمەش لەبەرئەوەی وەکو ئەورووپای کۆن سالانێك لەژێر ستەمی دیکتاتۆریدا ژیاوین، وەکو نوقومبوویەکی نێو دەریا دەست بۆ پووشو پەلاشیش دەبەین!

دیموکراسی سیستەمێکە بەرهەمی فیکری مرۆڤەو پەیوەستە بە بەرژەوەندیو ئارەزووی مرۆڤەکانەوە، بۆیە بەردەوام قابیلی گۆرانو دەستکاریو زۆر جاریش دەستێوەردانە، ئەو هەموو ماندووبوونو سەرفکردنی پارەو پوولو سەروەتو سامانەی کە بۆ یاریی دیموکراسی سەرف دەکرێت، دەتوانرێت لە پرۆژەی زۆر سوودمەندتردا بەکاربهێنرێت، مرۆڤەکانیش پێویستە بیر لەوە بکەنەوە کە بۆچی چارەنووسو گوزەرانو ئایندەیان پەیوەست بێت بە هەلبرینو دابەزینی چەند دەستێك، لە سیستەمێکدا کە هەواو ئارەزووی مرۆڤەکان حوکمی تێدا دەکاتو جیاوازی نییە لە نێوان پەرلەمانتارێکی زاناو نەزان یان مرۆڤدۆستو دیکتاتۆردا، کە ئەمەش جۆرێکە لە کۆیلایەتی، بەڵام لە بەرگێکی نوێدا.

کەواتە با هەموو هێلکەکان نەخەینە سەبەتەی دیموکراسییەوەو بە پروپاگەندەو قسەی گەرم باوەر نەکەینو بە هەموو ئاوازێك نەکەوینە شایی!!

# کارگێڕی بە گوفتار

ئەگەر پیری پەند بدە، ئەگەر گەنجی پەند وەربگرە!

چرای کەس تا بەیانی ناسوتێت!

ئیشی بەپەلە خاوەنی شەلە!

ئاوی پیس هیچ شتێک پاک ناکاتەوە!

بێ ناوی چاکترە لە بەدناوی!

زستان ڕۆیی ڕوو ڕەشی بۆ خەڵوز مایەوە!

هەتا قەفەس تەنگتر بێت، ئازادی شیرینترە!

شوان هەتا دابنیشێ، لە مەڕەکەی دوور دەکەوێتەوە!

سەرجەم ئەم وتانە لە پەندی پێشینانی کوردییەوە وەرگیراون.

# کەس پێشەوای درۆزنی خۆش ناوێت!

## کارگێڕی بە چیرۆك

پێشەوایانی راستەقینە شوێنکەوتوانی خۆیان خۆش دەوێت، هەرگیز ناتوانن درۆیان لەگەڵ بکەن، ئەوانیش وەك کەسێکی پیرۆزو موقەدەس بۆیان دەڕوانن‌و لە ناخی دڵیانەوە ڕێزیان دەگرن، بۆیە ئەو جۆرە پێشەوایانە هەردەم لە دڵ‌و دیدی نەتەوەدا دەژین‌و گەل وەکو چاوی خۆی پارێزگارییان لێ دەکات.

پێشەوای راستەقینە هەموو هیواو ئاواتی بەرژەوەندی میللەتەکەیەتی‌و هەموو ژیانی تەرخان کردووە بۆ خزمەتکردنی یەکە یەکەی هاونیشتیمانانی. ئەو ڕۆژەش هەست بە شادمانی دەکات کە دەبینێت نەتەوەکەی لە گەشەپێدان‌و پێشکەوتندایەو بەرەو لوتکەی سەرکەوتن هەنگاو دەنێت‌و ماڵاوایی لە هەژاری‌و دواکەوتن دەکات‌و کۆمەڵگایەکی رۆشنبیرو زانست پەروەرو بەرهەمهێن پێك دەهێنن.

پێشەوای دڵسۆزو گەورەو رابەر لەگەڵ خەندەی نەتەوەکەیدا پێ دەکەنێت‌و لەگەڵ گریانیاندا خەمگین دەبێت‌و فرمێسکەکانیان دەسڕێت‌و هیوایان پێ دەبەخشێت!

ئەمە سروشتی راستەقینەی هەموو مرۆڤەکانە، ئەگەر مرۆڤ خۆی بە هەڵەدا نەبات‌و چاوپۆشی لەم حەقیقەتە نەکات، هاوکات لە ناو گیانداران‌و زیندەوەرانیشدا هەمان ڕێو ڕەسم پیادە دەکرێت‌و هەرگیز بە سەرکردەی درۆزن رازی نابن‌و ڕێگە نادەن کەسێکی ناپاك‌و ناراست رابەرایەتیان بکات، بۆ راستی ئەم قسەیەش دەتوانین سەرنج بدەینە ئەم ڕووداوە:

زانایەك دەگێڕێتەوەو دەڵێت: ڕۆژێك مێروولەیەکم بینی نزیك بووەوە لە باڵە کوللەیەك، ویستی هەڵی بگرێت، بەڵام بۆی هەڵنەگیرا، ڕۆیشت‌و زۆری پێ نەچوو لە گەڕانەوەیدا کۆمەڵێك مێروولەی لەگەڵ خۆیدا هێنا، پێش ئەوەی مێروولەکان بگەنە جێ، باڵە کوللەکەم لابرد، کاتێك مێروولەکەو پۆلەکەی هاوڕێی گەیشتنە جێگای مەبەست، مێروولەکە بە دەوروبەری ئەو جێگایەدا دەسوڕایەوەو ئەوانیش لەگەڵیدا دەسوڕانەوە پاش ئەوەی کە هیچیان بەدی نەکرد گەڕانەوە!

دوای ڕۆیشتنی ئەوان وەکو جاران باڵە کوللەکەم لە جێگاکەی خۆی دانایەوە، دوبارە مێروولەکە بەویدا هات‌و بەرێکەوت چاوی بە باڵە کوللەکە کەوتەوە، دیسان هەوڵی هەڵگرتنی دایەوە، بەڵام هەوڵدانەکەی بێ سوود بوو، دووبارە چوو بە شوێن کۆمەڵە مێروولەکەدا تا ئەوان هاتن وەکو جاری پێشوو باڵە کوللەکەم لابرد، دیسان بە چواردەوری ئەو جێگایەدا کە باڵە کوللەکەی لێ بوو سورانەوە، پاش ئەوەی هیچیان بەدی نەکرد شوێنەکەیان بە جێهێشت!

منیش بۆ جاری سێیەم باڵە کوللەکەم دانایەوە، مێروولەکە دوبارە هاتەوە ئەو شوێنەو باڵە کوللەکەی بینی، ئەمجارەیان بە پەلە ڕۆیشت بە شوێن هاوڕێکانیدا، دیسان لەگەڵیدا هاتن‌و منیش پێش گەیشتنی ئەوان باڵە کوللەکەم شاردەوە!

بە گەیشتنیان دەستیان کردەوە بە گەڕان‌و پشکنین لەو ناوچەیەدا کە پێشتر باڵە کوللەکەی لێ بوو!

دوای ئەوەی دڵنیابوون هیچی لێ نییەو لەوەش دڵنیا بوون کە ئەو مێروولەیە درۆیان لەگەڵ دەکات، هەموویان لە دەوری مێروولەی سەرۆك کۆبوونەوەو ئەویان خستە ناوەڕاستی خۆیانەوەو بە هەموویان شاڵاویان بۆ بردو مێروولەی بەستەزمانیان پارچە پارچە کرد، لە کاتێکدا ئەو نەیدەویست درۆیان لەگەڵدا بکات، بەڵام ئەوان کە ئەو کارەیان بینی، وایان زانی هەر سێ جارەکە درۆی لەگەڵ کردوون، بۆیە رازی نەبوون بە سەرکردەیەك سێ جار بەرەو درۆ رابەرایەتییان بکات؟!

لەم چیرۆکەوە فێردەبین کە:

١- دەبێت پێشەوا راستگۆ بێت‌و هەرگیز درۆ لەگەڵ شوێنکەوتووانیدا نەکات.

٢- درۆکردن مانای زیرەکی‌و سیاسەتمەداری نییە، چونکە (الرائد لایکذب اهله).

٣- دەبێت سەرۆك زۆر دڵسۆزبێت بەرامبەر گەل‌و نەتەوەکەی.

٤- خۆشەویستی‌و ڕێزگرتنی ئەندامانی گەل بۆ سەرۆك‌و پێشەوا پەیوەستە بە راستگۆی‌و دڵسۆزی ئەو لەگەڵیاندا.

٥- هەر سەرکردەیەك دەیەوێت ناوێکی جوان لە مێژوودا بۆ خۆی تۆمار بکات، با خزمەتکاری نەتەوەکەی بێت‌و پێش قسەی جوان کردەوەی جوانیان پێشکەش بکات.

٦- نابێت ئەندامانی گەلیش ئەوەندە ساویلکە بن کە بە ئاسانی فریو بخۆن‌و هەرچی بێت‌و کڵاویان لەسەر نێت، ئەو پەندە کوردییەش زۆر جوانە کە دەڵێت: (ئەگەر جارێك فێڵم لێکردی خوا من بگرێت، بەڵام ئەگەر دووجار فێڵم لێکردی خوا خۆت بگرێت!).

٧- هەر کەسێك لە کونێکەوە دووجار گەزرا با تەنها لۆمەی خۆی بکات‌و لۆمەی کەس نەکات.

# ئایا تۆ چۆن کەسێکی؟



و. لەفارسییەوە: مەسعود محەمەد هانەژاڵەیی

بۆچی لەم ڕۆژانەدا زۆربەی خەڵکی تورەو کەم حەوسەڵەن‌و بە بچوکترین شتێك، بە واتایەکی جوانتر (بێ دەنگ ناوەستن)؟

بە هەمان شێوە دەزانین کە مرۆڤی بە وجودی سروشتێکی مەدەنی هەیە، واتە بەتەواوی حەزدەکات لەناو کۆمەڵ‌و لەگەڵ کۆمەڵدا بژی، بەڵام ژیان لەناو کۆمەڵگادا گوزەراندن ئوصول‌و ئاداب‌و نەریت‌و یاسای خۆی هەیە کە مرۆڤە تورەکان لەبەر هەندێ هەڵچون‌و تورەیی کەمتر دەتوانن کە خۆیان لەگەڵ ئەمەدا رابهێنن.

کەسێکی ئارام‌و مەحکەم‌و بەئاگاو بێ وێنەیت، دەبێت بەردەوام بەسەر تورەیی‌و رەفتارو گوفتاری خۆتدا زاڵبیت.

دەبێت هەستی کارەکانت لەگەڵ دەوروبەرەکەتدا کە هاورێکن لەگەڵ کەسایەتی کۆمەڵایەتی‌و مرۆڤایەتی خۆتدا، بە ئاگابوون لەمەسەلەیەك کە لە بیرچووە، لە تاقیکردنەوەی (خۆناسین)ەوە دەردەکەوێت.

بە چوونەوە بەسەر(خشتەی ئیمتیازات) دەبینین چۆن کەسێکی‌و لەژیانی کۆمەڵایەتی خۆتدا تا چ ئەندازەیەك بەسەر تورەبوونی خۆتدا زاڵ دەبیت، ئەگەر دەتەوێ ئەم خاڵەی خۆت باش بناسیت دەی ئەوە عەرزو ئەوەش گەز!

یەکەم: کەسێك بە هەڵە جەرەسیماڵت لێ بدات، پەرچە کردارت چۆن دەبێت؟

أ- بە رووی خۆش ڕێنمونی دەکەم.

ب- روونی دەکەمەوە کە جەرەسی ماڵەکەمانی بە هەڵە لێداوە، هەرئەوەندە.

ج- دەڵێم ئەگەر باشتر سەیرت بکردایە نارەحەتت نەدەکردین.

دووەم: حەزت لەکام لەم رەنگانەی خوارەوەیە؟

أ- سور. ب- شین. ج- سەوز.

سێیەم: دەبینیت یەکێك لە هاورێکانت لە شەقامەکەدا لەگەڵ کەسێکدا بەشەڕ هاتووە؟

أ- بەرەو رووی دەڕۆم‌و بەشەڕ لەگەڵ بەرامبەریدا کۆتایی پێ دەهێنم.

ب- دوای وەستانێکی کەم، ملی ڕێگە دەگرم‌و دەڕۆم.

ج- بە لایەنگیری لە هاورێکەم خۆم تێوەر دەدەمە ناو شەڕو ئاژاوەکە.

چوارەم: لە ڕۆژی پشووی هاوین دایت چی دەکەیت؟

أ- بە باشی دەزانم لە ماڵەوە بمێنمەوەو بە خوێندنەوە خۆم خەریك دەكەم.

ب- کاتەکانم بە پیاسە کردن بە ناو پارکێکی سەوزو گەورەدا بەسەر دەبەم.

ج- ئەوەندە کاری بە پشتدا کەوتووم هەیە لە هیچ شتێکی تر بیرناکەمەوە.

پێنجەم: سێ فیلم لەسەر شاشەی سینەماکان پیشان دراوە، بە تێگەشتن لە ناونیشانی فیلمەکان کامیان هەڵدەبژێریت؟

أ- کوشتار لە شەمەندەفەردا.

ب- کێڵگەی سەوز.

ج- ئیتر حەوسەڵەی چون بۆ سینەمام نییە.

شەشەم: لەناو ئەندامانی خێزاندا، گفتوگۆ سەبارەت بە مەسەلەیەکی گرنگ دەکرێت، ئێستا نۆرەی تۆیە کە بۆچوونت راگەیەنی:

أ- زۆر بە عاقڵی و وردەکارانە هەوڵ دەدەم ئەوانی تر رازی بکەم.

ب- بە بەرزکردنەوەی دەنگم و قسەم بە فورسی نیشانیان دەدەم.

ج- کاتێ دەزانم کەسەکە بۆ قسەکانم گوێ ناگرێت بە باشی دەزانم قسە نەکەم.

حەوتەم: پەیوەندیت بەکام یەك لەم نوسراوانەی خوارەوە هەیە؟

أ- ماڵەوانی. ب- تۆپی پێ. ج- یۆگا.

هەشتەم: بە بۆچونی تۆ باشترین رێگا بۆ گەیشتن بە ئارامی چییە؟

أ- گوێ گرتن لە مۆسیقایەکی نەرم و هێمن.

ب- خواردنی حەبێکی ئارام بەخش.

ج- تەنیا کەمێك گریان.

نۆیەم: لە نێوان تۆو یەکێ لە هاورێکانت ناکۆکی دروست بووە:

أ- قسەکانی دڵمی پێ دەڵێم و ئیتر پەیوەندیم پێوەی نییە.

ب- هەوڵ دەدەم بە مەنتیق و بەڵگە هێنانەوە ناکۆکی نێوانمان برەوێنمەوە.

ج- بە چاکی دەزانم کە دەبێت خۆ راگر بم، تا ئەو یەکەم هەنگاو دەنێت بۆ کەمکردنەوەی ناکۆکیەکانمان.

ئێستا (خشتەی ئیمتیازات) سەیر بکەین و بزانین کام لەم گروپانەیت.

| پرسیار | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| أ | ١ | ٣ | ١ | ٣ | ٣ | ٣ | ١ | ٢ | ١ |
| ب | ٢ | ١ | ٣ | ١ | ١ | ١ | ٣ | ١ | ٣ |
| ج | ٣ | ٢ | ٢ | ٢ | ٢ | ٢ | ٢ | ٣ | ٢ |

- لە ١٠ بۆ ٢٠/

★ تۆ خاوەن دەرونێکی گەورەو باوەر پێکراویت و بەردەوام هەوڵ دەدەیت کە بە ئارامی پێویستی کێشەی خۆت چارەسەر بکەیت.

★ تۆ بە چاکی بە ئاگاییت لەگەڵ ئەوەدا هەموو خەڵك کەم و زۆر کێشەی وردو درشتیان هەیە رەنگە لە ژیاندا ئارام نەبن، هەر لەبەر ئەو خۆراگری و هێمنی یە لەگەڵیاندا چاك بیت، لەبەرئەوە لەو بروایەدایت کە هیچ کارێ بە توورەییەوە بە رێ ناچێ و کێشەیەکیش چارەسەر ناکات.

★ تۆ بەردەوام دوور دەگری لە رق و توورەیی و تا ئاستێ هەوڵ دەدەیت لە هەموو جێگایەك ئارام بیت لە زۆربەی ئیش و کارەکانی ژیان و پێش هەر بریار دانێکی بەپەلە یان بریارێکی هەڵە، زۆرتر کۆنترۆلی خۆت دەکەیت بەوپەری لەسەر خۆییەوە کار دەکەیت.

تا کاتێ بە پێکەنینێك درکەکان بگۆری بە گوڵ، کاتێك کە پێبکەنیت و هیچ مەبەستێکت نەبێت، تەنیا بۆ خەندە خستنە سەر لێوی خەڵکی، کەسێکی ئارام و خۆراگریت و خەشم و توڕەیی تۆ بێمانایە.

★ بەم کارە باشەی کە لە ناخی تۆدا شاراوەتەوە دەبێت لە خۆتدا بیهێڵیتەوەو جوانتری بکەیت.

- لە ٢١ بۆ ٢٥/

هەرکاتێ زۆر زوو دێیتە وەلام و کۆنترۆلی خۆت لە دەست دەدەیت تۆ بە شێوەیەکی گشتی لە پەیوەندیدایت بە ژیانێکی ئارام، بەڵام لەبەرامبەر هەندێ لە گومانەکانی کەسانی دەوروبەری خۆت کاردانەوەیەکی توند پیشان دەدەیت، ئەڵبەتە هەندێجار هەوڵ دەدەیت تا رادەیەکی پێویست، ئارامی و مەنتیقی خۆت بپارێزیت، بەڵام هەندێجار ناتوانیت چاوی خۆت بە نارێکی و لاری خەڵکەکان دابخەیت و لە ئەنجامدا رق و تورەیی بەسەرتدا زاڵ دەبێت، لێرەدا کە تۆ تاکێکی خاوەن کەسایەتی و پتەو لە هەموو رووەکانەوەو لەسەرخۆیت، چاوەروانییەکی تایبەتت لە کەسانی تر هەیە، لە حاڵێکدا کە دەبێت کە بزانیت وەك ئەم نیت و بەهیچ تەماشا کردنێ ناتوانیت خاڵە لاوازەکانی هەموو خەڵك بە تەنیا چاك بکەیتەوە. کەسێتی خۆت بێ لایەن پیشان بدە بەتورەیی و توندی خۆت نەخەیتە ژێر پرسیار.

ژیان سەرانسەر بەرزی و نشێوە، تاڵ و شیرینی هەیە، کەم و زیادی هەیە، چی لەوە باشترە کە هاورێك بیت لەگەڵ پێکەنینێکدا

کە بەشێوەیەکی زۆر جوان دەردەبردرێت. ئامۆژگارییەکی گرنگتان دەکەم هیوادارم رەفتاری پێ بکەن و لەئەنجامدا دەیبینن، بە ئێمە بڵێن: پێکەنینێك کە دەیکەیتە دیاری بۆ کەسانی تر، هەمیشە پێکەنین بە شیرینتر پێتان دەدرێتەوە، ژیان بە سەخت نەگریت و بەسەر خۆتدا زاڵ بیت تا بتوانیت لەگەڵ هاوشێوەکانتدا ژیان بەخۆشی بگوزەرێنیت.

- لە ٢٦ بۆ ٣٠/

خوشك و برای من بەراستی ئێستا واتای (ئارامی) و هێمنی دەزانیت!

لەم قسانەمان دڵگران نەبیت لە بەر خاتری خۆت دەڵێین: ژیان تا ئەندازەیەك هەندێ سەخت و دژوارە، بەم هەڵس و کەوتە توندە زیاتر خراپ و لێڵی نەکەیت.

ئەمە بزانیت کە ئەگەر تۆ بە دەنگی بەرز قسە بکەیت، رەنگە بەرامبەرت هاوار بکات بەم رێگەیە کە گرتووتە، دڵنیابە بە مەبەستەکانت ناگەیت، یان زۆر بەنارەحەتی پێیان دەگەیت، بەڵام هەموو شتەکان تێپەرین بۆچی تۆ ئاگات لەسەلامەتی لەش و گیانی خۆت نیە؟

مەگەر ئێمە چەندمان بە دونیاوە ماوە کە ئەم تەمەنە دوو رۆژەیە، بەم شێوەیە لە تەواو رق و تورەیی، بەجێ بهێڵین، خەمەکان لەدەمی خۆیدا بکرێتەوە، لە پێش ئاوێنەیەکەوە خۆت ببینەوە، پێبکەنە، حەیف نییە ئەو سیما جوانەت لە ژێر ئەو دەمامکە تاریك و تورەییەدا شاردۆتەوە؟

رق و تورەیی تەنیا ئازار بە تۆ دەگەیەنێت و بەس! دەوروبەرەکەت یەکە یەکە بۆشت دەگرن و وردە وردە بەکەسێکی تورەو عەصەبی دەگۆرێیت.

ئەگەر کەسێك خراپەی لەگەڵتدا کرد، وەڵامی بە خراپە مەدەرەوە، حەتمەن ئەو کێشەیەکی بۆ خۆی هەیە، ئەگەر تۆ کێشەت هەیە بۆچی تورەیی خۆت بە رووی ئەوانی تردا دەتەقێنیتەوە؟ ئەوان دەبێت چ گوناهێکیان هەبێت؟

ئامۆژگاریت دەکەم کە ئەم شێوازەت فرێ بدەیت و زاڵ بیت بەسەر خۆتدا، پێبکەنیت، پێکەنینت بەژیان و گرفتە گەورەو بچووکەکان بێت، بەها بۆ کەسایەتیت دابنێیت.

خۆشەویستی ببەخشیتە کەسانی تر، تۆ بە رق و تورەیت یەکەم زیان بە رۆح و لەش دەگەیەنیت و دوایش لەشی ئەوانی تر دەلەرزێنیت.

بەسەر خۆتدا زاڵ بیت، گەرمای محەبەت، لەش و رۆحت بتەنێ و بزانیت کە دەوروبەرەکەت نیازمەندی میهرەبانی و پێکەنینی موحیبەت ئامێزی تۆن.

سەرچاوە: گۆڤاری( اهنگ زندگی).



# با لە کارەکانماندا پلاندانەر بین!

و. هێمن بەهجەت ژانکۆی سلێمانی

پلان دانان: ئەو چالاکییە کە کەسێك دەگوازێتەوە لەباری ئێستاوە بۆ ئەو بارەی کە دەیەوێ پێی بگات، ئەوەش بەپشت بەستن بە پلانو بەرنامە ڕێژی جیاواز.

بۆچی زۆرێك لە خەڵکی پلان دانانێن؟

١- کەمی متمانەو بروا بەخۆبوون، چونکە بە بۆچوونی خەڵك پلان دانان شتێکی تایبەتە بە پیاوانی کار.

٢- نەبوونی زانیاری بەرامبەر بە پلان دانان.

٣- هەوڵنەدان بۆ پابەندبوون بە پلان دانانەوە.

٤- هەندێ گومان دەبەن کە پلان دانان داوای کاتێکی بە بایەخ دەکات، کە بەسەری بەرین لە بەدەست هێنانی کارەکاندا، چونکە سروشتی مرۆڤ حەزی بە سەرکەوتنو بە دەست هێنانی بەروبومی زۆرە.

٥- پشت بەستن بە گومانو ئەفکارەکانو هیوا درێژی.

ئەوەی کاربکات بەبێ پلان رازییە بە کەمترین دەرەنجام، ئەوەی کە بە پلانەوە کاربکات رازی نییە تەنها بە زۆر ترین دەرەنجام نەبێت.

* باشیەکانی پلان دانان:

١- ڕێگایەکی ژیرانەو دروستە بۆ دەرکردنی بڕیارو چارەسەری گرفتەکان.

٢- شارەزایو زانینو لێهاتوی تێدا کۆدەبێتەوە، لەگەڵ بەدەست هێنانی ئامرازی گونجاو.

٣- یارمەتی دەرە بۆ کێشانی نەخشەی داهاتوت هەرچەندە ترسناكو گرفتاوی بێ.

٤- هەلی سەرکەوتنو بنەما ترسناکەکانت بۆ دیاریدەکات.

٥- یارمەتیت دەدات بو دەستکەوتنی وێستگەی سەرکەوتوو لەژیانتدا.

٦- هانت دەدات بۆ بیرکردنەوە لەداهاتودا بەشێوەی راستو بەرچاو رۆشن.

٧-وات لێدەکات لە داهاتودا بەشێوەی بەهێز هەڵسوکەوت بکەیت.

٨- کەسایەتییەکی دیار دەبیتو خەڵکی هیوات پێ دەخوازن.

بەم شێوەیە پلاندانان کارێکی ئاسانەو مێشك دەکاتەوە لەسەر گۆڕانکاری بەشێوەی بەردەوام، هەروەك چۆن وێنەیەکت پێدەبەخشێ لە داهاتوودا.

* سودەکانی پلاندانان:

١- دیاریکردنو ئاراستەکردن، پارێزگاری لەبیرکردنەوەی داهاتوت دەکات.

٢- هەوڵەکانت کۆدەکاتەوەو ڕێکی دەخات، کاردەکات بە شێوەی پەیوەندی نێوان هەوڵەکانو روانینەکانو لێکۆڵینەوەکان.

٣- پێوەرەکان دەستەبەردەکاتو دیاریدەکات، ئەو ئامرازانەی کەدەبێتە هۆی ئەندازەی پێشکەوتن بەدەست دەهێنێ.

٤- روونکردنەوەی مەشخەڵی ڕێ، پلاندانان یارمەتیت دەدات بۆ دیاریکردنی ئەو کارەی کە دەتەوێت بیکەیت، وە گەیشتن پێی.

٥- کەسێکی ئامادە، وات لێدەکات کە ئامادەکاربیت بۆ هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ بارودۆخو گرفتە ناکاوەکان.

٦- ئاشکراکردنی بارودۆخ، شێوازێکی روونت پێ دەبەخشێ بۆچۆنییەتی کارلێککردن لەگەڵ شتە گرنگەکان،و چالاکییە جیاوازەکان.

٧- هاندانی بەردەوام، پلاندانان پاڵت پێوە دەنێت بەرەو پێشەوە، هەنگاوەکانت بەرەو پێش دەبات، گیانی وزەو هێزت بەرزدەکاتەوە، لەگەڵ خەڵکی دەوروبەرتدا پەیوەندی کردنو روانینت باش دەکات.

* هەنگاوە کانی پلاندانان:

١- شیکردنەوەی دۆخی ئێستا.

٢- دیاریکردنی ئامانجەکانت.

پلاندانان نهێنی سەرکەوتنە، گرنگترین شت لە پلاندانان ئەوەیە کە خاوەن پەیامو بەرچاو روون بیت لەژیاندا... زانایان وای دەبینن ئەو کەسەی کە پەیامو بەرچاو روونی لە دەست بدات زیاتر توشی گرفتی دەروونیو کۆسپ دەبێت...

* بێگومان بوونی ئامانجی روون (٣) پایەی هەیە:

١- متمانەیەکی قوڵ بە ئامانجەکە، دەبێت بروات بە بەدەست هێنانی ئامانجەکانت هەبێتو زاڵ بیت بەسەر شوێنەواری خراپی ئەوکەسانەی کە دەیانەوێت لە گرنگی ئامانجو تواناکانت کەم بکەنەوە.

٢- داهێنان، فکرەکانت دابنێو بیهێنە بەرچاوت وەکو منداڵێك لەکاتی هێنانە پێش چاوی خەونەکانی.

٣- بروای بەردەوام بەخوای بەتوانا لەسەر سەرکەوتنت پاشان متمانە بە تواناکانت.

* سیفاتی ئامانجی راستە قینە:

١- روون وەك رۆژ.

٢- دیاری کراوو ورد.

٣- ئارەزوت بۆ کردنی کارەکە، پیویستە نیازت باش بێت ئەگەر نەتتوانی ئەوا پاداشتی نیازەکەت هەیە، ئەگەر توانیتو کردت ئەوا دووجار پاداشتت بۆ هەیە.

٤- دەبێت کرداری بیت، واتە رێوشوێنی کرداریو سەردەمیانە بگریتە بەر، شتەکان بنوسیتەوە، بگونجێ لەگەڵ پێکهاتەی کەسیو بیرکردنەوەتدا.

٥- شیاو بیت بۆ بەدیهێنانی، لەگەڵ ئاستی زانستیو کۆمەڵایەتیو بگونجێ لەگەڵ تواناو بارودۆخی کەسەکەدا.

* چۆن دەست بکەین بە پلاندانان؟

١- لایەنەکانی توانات دیاری بکە، دیار ترینیان جیابکەرەوە.

٢- دیاریکردنی لایەنی لاوازیت.

٣- زانینو ناسینی دەرفەتی گونجاو.

٤- ناسینی پێشهاتو رووداوەکان.

* چەند هەنگاوێکی ئاڵتونی بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانت:

١- پشت بەستن بەخوا، بێ تاقەت نەبی لەوەی کە لە خوا داوا دەکەیو ناتداتێ.

٢- ئامانجەکانت بنووسە لە دەفتەرێکی بچوکداو هەڵی بگرە لای خۆت، بگەڕێوە سەری هەموو رۆژێك.

٣- لێکدانەوەو بیرلێکردنەوە.

٤- جەخت کردنەوەیەکی باش لەکاتی ئێستا.

٥- وا لێك بدەرەوە کە بە راستی تۆ ئامانجت پێکاوە.

٦- ئارام گرتن لەسەر بەرپرسیارێتی دەروونو ژیانت.

٧- قبوڵ کردنی گۆڕانکاریو هەمیشە نەرمی بنوێنە لەکارەکانتدا.

٨- دەستنیشان کردن، دەستنیشان کردنی ئەوەی دەتەوێو بە دەست هێنانی ئەوەی دەیخوازی.

٩- بەردەوامبە لەسەر ئامانجەکانت بەپێی یەکەمینیو لەپێشترینیان.

لە کۆتاییدا دەبێت پلانە یەکەمینەکانت لە جێبەجێکردنی نەخشەکەدا لە گرنگترین ڕێو شوێنەکان بێتو پاڵت بنێت بۆ گەشەکردنو پێش کەوتنی بەردەوام، لەسەر تۆیە کەبەرچاو روون بیتو ورد بیتەوە کە کامەیە پلانی یەکەمتو کەی سەرەتای دەست پێکردنییەتی؟ کێشە نییە گەر نەخشەی یەکەم بەرێژەیەك ئاسان بێت هەتا وەکو پاڵنەربێت بۆ ئەنجامدانی شتە قورسو گرنگەکان، سەرکەوتوو دەبیت ئەگەر پلان دابنێیت، هیوا دوورەکانت دێتە دی.



بەشی یەکەم

م.هاژە شیروانی

# جێهێشتنی کارگێڕی

زۆرجار لێرەو لەوێ لەسەر دیاردەی جێهێشتنی کار لە لایەن فەرمانبەر یا کارمەند یا بە واتایەکی تر بڵێین ئەو کەسەی کە لە دەزگایەك یا دامەزراوەیەك کار دەکات، جا چ سەر بە کەرتی گشتی یان تایبەت بێت، وەکو خویەکی هەمیشەیی کارەکەی بە جێدەهێڵێ و کاتی دەوامی فەرمی دەکوژێت بە گەڕان و سوڕان بە نێو یەکەو هۆبەکانی دامەزراوەکەی بەبێ لەبەر چاو گرتنی بەرژەوەندی گشتی و هەستکردن بە بەرپرسیارییەتی بەوەی کە کۆمەڵێك کار هەیە کە پێویستە لەسەری لە وادەی دیاریکراودا جێبەجێیان بکات و مامەڵەی ئەو کەسانەی کە ڕێیان پێی دەکەوێت بە ڕێ بکات، زۆرجاریش دەرچوونی بۆ دەرەوەی دامەزراوەکەی بە بێ ئاگاداربوونی بەرپرسی یەکەم و هەندێکجاریش نەچوون بۆ دەوام بەبێ هیچ هۆیەکی مەنتیقی، ئەمانە و گەلێك دیاردەی لەم شێوەیە، لە ژێر ڕۆشنایی ئەم بابەتە ئەم چەند پرسیارە لە بیرو زەینی هەریەکێك لە ئێمەی خوێنەر سەر هەڵدەدات: کێن ئەو کەسانەی کارەکەیان جێدەهێڵن؟ ئەو هۆکارانە چین کە کارمەندێك لە یەکێکی تر جیادەکاتەوە لە نێوان ڕاپەڕاندنی کارەکەی و بە جێهێشتنی؟ ئایا ئەم دیاردەیە تەنها لە دەزگایەکی دیاریکراو هەستی پێدەکرێت؟ یاخود ڕوونتر بڵێین چەند کەسێکن لە نێو دامەزراوەکەدا کە ئەم خەسڵەتەیان تیا بەدی دەکرێت؟ ئایا جیاوازی کردن لە مامەڵەی بەڕێوەبەر لەگەڵ کارمەندەکان هۆکارێکە؟ یان کارمەندەکان خۆیان هۆکارن بۆ دروستبوونی ئەم دیاردەیە؟ شوێنەوارە خراپەکانی چین؟ چۆن بتوانین چارەسەری گونجاو و لە باریان بۆ بدۆزینەوە؟ ئەمانەو گەلێك پرسیاری تر لە ڕێگای ئەم بابەتەوە دەتوانین بە ڕاشکاوی قسەیان لە سەر بکەین.

سەرەتا دەبێت دەستنیشانی چەمکی جێهێشتنی کارگێڕی بکەین، بەوەی کە ئەو دیاردەیەیە لە جێهێشتنی ئەدای کارگێڕی بە بێ هیچ ڕێزو ڕێساو ڕێنمایی و یاسایەکی ڕێکخراوی دانراو تاوەکو ئەو ئەدایە بە باشترین شێوە جێبەجێ بکرێت.

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە بەرژەوەندی جێهێشتنی کارگێڕی بریتییە لە بەرژەوەندی:

★نەبوونی ڕێکخستنێکی کارگێڕی دیاریکراو.

★دیاری نەکردنی ئەرك و بەرپرسیارییەتی.

★ نەبوونی تۆمارو فایلی ڕێك و پێك.

★ نەبوونی سیستەمێکی دیاریکراو بۆ پاداشت و سەپاندنی سزاکان.

★ نەبوونی شێوازێکی جێگیر بۆ هەڵبژاردن و دامەزراندن و بەرزکردنەوەی زانستی ئەو کارمەندەی کە کارەکەی جێدەهێڵێ، ڕێزی کاتی ئامادەبوون ناگرێ و هەر کاتێ بیەوێت لە کارەکەی دەردەچێت بەبێ بوونی هیچ هۆیەك.

★ پابەند نەبوون بە یاساو ڕێساکانی کاری ڕێکخراو.

چەمکی جێهێشتنی کارگێڕی:

دواکەوتووی زۆرێك لە وڵاتان بۆ دواکەوتووی کارگێڕییەکەی دەگەڕێتەوە پێش بوونی هەر دواکەوتوویيەك لە لایەنی باری ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسیەکەی.

کارگێڕی سەردەمیانەش کەشێکی بەهێز لە کاروباری وڵاتان و ماوەی سەرکەوتن و پێش کەوتنیان لە بوارە جیا جیاکان و ئەو چالاکییانەی پێی هەڵدەستن دەتوانین تێبینیان بکەین بە سەیرکردنی وڵاتانی پێشکەوتووی وەك وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو ئەڵمانیاو بەریتانیا، دەبینین کە پێشکەوتنیان دەگەڕێتەوە بۆ کارگێڕییەکی پێش کەوتوو.

هەروەك دەبینین کە کارگێڕی لەم وڵاتانەدا دەناسرێتەوە بە وردبینی و نەرم و نیانی (الدقه والمرونه) کە هاوشانی هەموو ئاستەکانی کارکردن و ئەو مامەڵەیەی کە لەگەڵ فەرمانبەرەکانیان دەیکەن، لێرەوە بە پێویستی دەزانین کە تیشك بخەینە سەر ئەم لایەنە کە ئەویش لایەنی کارگێڕییە لەم وڵاتانە بە مەبەستی گەیشتن بە ئاستی داواکراو کە هەر هاوڵاتییەك بە هیوایەتی و هەر فەرامۆش کردنێکیش دەبێتە هۆی جێهێشتنی کارگێڕی.

جێهێشتنی کارگێڕی لە کارگێڕی (الادارة): بەستراوەتەوە بە دیاردەی نەهاتن (غیاب) و دواکەوتن لە چوونە سەر کار، جێهێشتنی کار زۆر لایەن و بواری خراپی لێدەکەوێتەوە لە لایەن فەرمانبەر، لە کاتی بەجێهێنانی ئەرکە فەرمییەکانی وەك هەڵاتن لە کارو مامەڵە جۆراوجۆرەکان و هەست بە بەرپرسیارییەتی نەکردن و دیاردەی (واسطة) لە ڕاپەڕاندنی کارەکان و ئیستغلال کردنی پێگەی کارو فەرامۆش کردنێکی بەرچاو لە پەیوەندی گشتی، ئەمەو سەرەڕای نەبوونی پاداشتی ماددی و مەعنەوی کەوا لە فەرمانبەر دەکات کە کارەکەی زۆر بە جدی ڕابپەڕێنی.

لێرەوە دەتوانین پێناسەی جێهێشتنی کارگێڕی بکەین بەوەی کە بریتییە لە (فەرامۆش کردنی فەرمانبەر بەو کار و ئەرکەی کە پێی سپێردراوەو یاساو ڕێساو ڕێنماییەکان دەست نیشانیان کردووە کە کاری گشتی لە ڕێگەیەوە ڕێکدەخرێت بە شێوەیەك کە دەرەنجامی خراپی لەسەر بەرهەمهێنان و ڕاپەڕاندنی کار لێدەکەوێتەوە) .

لە پاڵ دیاردەی جێهێشتنی کارگێڕی و بەرزبوونەوەی ئاستەکەی هۆکاری تریش هاوشانی ئەم دیاردەیەن وەك جێهێشتنی شوێنی کار لە لایەن فەرمانبەرو لە کاتی دەوامی فەرمی بە هۆی چوونی بۆ بازارو مەڵبەندەکانی دابین کردنی پێداویستییە سەرەکییەکان کە هەر هاوڵاتییەك پێویستییەتی، هەروەها نەمانەوەی ئەو فەرمانبەرەی کە لە پێگەیەکە بۆ ماوەیەك تا شارەزایی پەیدابکات و بە کارەکان ئاشنا بێت ئەمەش بە بەرزکردنەوەی بۆ پۆستی بەرزتر بە بێ بوونی هیچ شارەزاییەك لەو کارەی کە پێی سپێردراوە بە واتای دانەنانی کەسی شیاو لە شوێنی شیاو.

★ لە گەڵمان بن لە ژمارەی داهاتوو بۆ دوان لە سەر دیاردەو هۆکارەکانی جێهێشتنی کارگێڕی.




# سەرەتایەك لە زانستی ڕێکخستن

بۆچی ڕێکخستن دەخوێنین؟

بوونی ڕێکخراوەکان بە هۆی دابینکردنی قەوارەی کۆمەڵایەتییە بۆمان، کارکردنی بە گوێرەی هەرەمو چالاکی دیاریکراوو جیاکراوە دەبێت بۆ گەیشتن بە ئامانجی ویستراو، بە بێ بوونی ڕێکخراوەکان هەر تاکێك بە تەنها کاردەکات بە گوێرەی کۆششی خۆی لەوانەیە دەستەبەری بکات یا نەیکات، لە ڕێگای وەڵامدانەوەی ئەم دوو پرسیارەوە:

١- بوونی ڕێکخراوەکان بۆچییە؟

٢- گرنگی دیراسەکردنی ڕێکخستن چییە؟

بوونی ڕێکخراوەکان بۆچییە؟

هەروەك ئاماژەمان پێکرد بوونی ڕێکخراوەکان بۆ دابین کردنی قەوارەی کۆمەڵایەتییە کە یارمەتیدەرە بۆ بەکارهێنانی سەرچاوەی مرۆییو دارایيو کەرەستەی خاوو هەبووەکانو زانیاری بۆ گەیشتن بە ئامانجی ڕێکخستن، لێرەدا بوونی ڕێکخراوەکان بۆ گەیشتنە بەم چەند خاڵەی خوارەوە:

١- پۆلێن کردنی کار لە نێوان تاکەکان: دەستخستنی زۆرتری پسپۆڕیو توانست لە ئەدای کار، لێرەدا ئەندازیارو دکتۆرو ژمێریارو بەڕێوەبەرو هی تر هەن لە پسپۆڕییەکان کە توانستی کار دەستەبەر دەکەن.

٢- توانای بەکارهێنانی تەکنەلۆژیاو سەرمایەی چرو پر: بوونی ڕێکخراوەکان یارمەتیدەرە بۆ دابین کردنی دارایی کە دەتوانین خەرجی بکەین بۆ تەکنەلۆژیای پێشکەوتوو، لە دوایدا دەتوانین بەرهەم بهێنین بە قەبارەی زۆر کە باشترین بە کارهێنان بۆ سەرچاوەکانو دابین کردنو گێرانەوەی تێچوون دەستەبەر دەکات.

٣- توانای مامەڵە کردن لە گەڵ ژینگە: ڕێکخراو توانادارترە لە تاك بۆ ڕووبەڕووبونەوەی بەرامبەر ڕکابەرەکان لە مامەڵەکردنو کاریگەری لە سەر حکومەتو ڕێکخراوەکانی داراییو هاوردەکارانو بەکاربەران.

٤- توانای دابین کردنی تێچوونی ئاڵوگۆڕی: کاتێك کە ڕێکخراو هەڵدەستێ بە کرین (بەواتای ئاڵوگۆڕی پارە بە کەرەستەی خاوو ئامێر) توانادارترە لە تاك لە سەر پێدانی دەسەڵاتو دەستخستنی مەرجی باش کە زۆرێك لە تێچوونی بۆ دەگێڕێتەوە.

٥- توانای سەپاندنی کۆنترۆڵ بەسەر کرێکاراندا: ڕێکخراو تا سەرچاوەی زیاتری دەست بکەوێ تواناو دەسەڵاتی یارمەتیدەدات بۆ سەپاندنی کۆنترۆڵ لە سەر بەڕێوەبەرو کرێکار بۆ بەرژەوەندی هەردوو لایەن، بەڕێوەبەرانو کرێکاران مووچەو کرێو دوارۆژی کارکردنیان زامن دەکات لە بەرامبەردا ڕێکخراویش (ولاء)و پەیمانی ئەدای ڕێکخستنی بەرز دەستەبەر دەکات.

گرنگی دیراسەت کردنی ڕێکخستن: بوونی ڕێکخستنێکی دروست بۆ ڕێکخراو یارمەتیدەدات بۆ گەیشتن بە مامەڵەکردن لە گەڵ بارودۆخە جیاوازەکان، دەستخستنی کێبەرکێی بەرز بۆ

ڕێکخــراو، دەستخســتنی توانــای مامەڵــە کردن لەگەڵ جۆری هێزی کار، دەستخســتنی توانســت و توانای داهێنان لە ئەدای ڕێکخســتن بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- دەستخســتنی توانــای مامەڵەکــردن لــە گــەڵ بارودۆخە جیــاوازەکان: بوونــی یەکەکانی ڕێکخســتن و سیســتەمی کار یارمەتیــدەری ڕێکخــراوە بــۆ کارلێککــردن لە گــەڵ بارودۆخە جیاوازەکانــی وەك: کێبەرکــێ و گۆڕینی ئامانجی ڕێکخــراوو گۆڕینــی تەکنەلۆژیــاوو مامەڵەکردن لەگەڵ بازارەکان و بەکارهێنەری هەمیشــە گۆڕاو، لە گەڵ بوونی یەکەی ڕێکخســتنی پســپۆر (وەك لێکۆڵینەوەی بــازار) دەتوانێ یارمەتیدەر بێت بۆ داهێنانــی بەرهەم و خزمەت و شــێوازی مامەڵەی کاریگەر لە گەڵ بازارە گۆڕاوەکان (ناجێگیرەکان).

٢- دەستخســتنی کێبەرکێی بەرز بۆ ڕێکخراو: توانــای ڕێکخراو لــە ڕێگای سیســتەمی کارکردن تیایــداو بەڕێوەبەرییەکانــی یارمەتیــدەرە بــۆ بەرزکردنەوەی توانای ڕێکخراو لە ســەر پێشکەش کردنــی کاڵاو خزمەتێك کە جێگــای ڕەزامەندی بەکاربەر بێــت، هەروەك یارمەتی بەرزکردنەوەی کارزانــی بەڕێوەبــەرو کرێــکاران لــە بنیاتنانی ســتراتیژییەت و شــێوازی کارو بڕیاردانی دروست کــە یارمەتیــدەر بێت بۆ بەرزکردنــەوەی توانای کێبەرکێی ڕێکخراو.

٣- گەیشــتن بــە توانای مامەڵەکــردن لەگەڵ جۆراوجۆری ســەرچاوەی مرۆیــی: ڕێکخراوەکان بەڕێوەبەرو کرێکاری جــۆراو جۆر بەکار دەهێنن لــە لایەنــی فێرکــردن و کارزانی و کەســایەتی و پاڵنەرو درك پێکردن و پێکهاتەی تەمەن و ڕەگەزو بوونی ڕێکخســتنی ســەرکەوتوو کەفالەتی بوونی سیســتەمی کارکردن و سیاســەتێك کــە دەتوانێت سوودمەند بێت لەم جۆراوجۆرییە، لەگەڵ ئەوەی کــە ئەم جــۆراو جۆرییە لە مــاوەی کورتخایەندا گیروگرفتــی لێدەکەوێتــەوە بە تایبەتــی ئەگەر سیستەمێکی کۆنترۆڵکردن نەبێت لە مامەڵەکردن لە گەڵیدا، بەڵام سیســتەمی کارگێڕی و سیستەمی کارپێکردنی ئــەو دەســتەبەر دەکات (بەتایبەتی سیاســەتی داهاتی مرۆیی) لە توانای بەرز لە سەر وەبەرهێنانی جۆراوجۆر لە سەرچاوەی مرۆیی لە ماوەی درێژخایەن.

٤- گەیشتن بە داهێنان: لە گەڵ بوونی داهاتی مرۆیی جۆراوجۆر ڕێکخراو دەتوانێت لە ڕێگایەوە کۆبونــەوەو لێژنــەکان و شــێوازەکانی گەیاندن و داهێنان بــکات لە دەرچواندنــی وزەی داهێنانی و داهێنەرانــەی کرێکارەکانــی، ئەمەش لــە ڕێگای ئایدیــای نــوێ و ســوودبەخش کــە یارمەتیدەرە بــۆ ڕێکخــراو بــۆ گەیشــتن بــە ئامانجەکەی بە تێچوونێکی کەم.



# خەندەی هەڵسوکەوت نافرۆشرێت!

## کارگێڕی

پیاوێکــی خاوەن کار کــە خەڵکی وڵاتانی ســێیەم بــوو، ســەردانی یەکێــك لــە کارگە گەورەکانی لە وڵاتانی ئەوروپای پیشەسازی کرد، بە هاورێیەتی بەڕێوەبــەری کارگەکە هەموو بەشەکان و ئامێرە پێشکەوتووەکانی کارگەیان بەســەرکردەوە، لــەو ســەردانەیدا چاوی بە جۆرەها ئامێری پێشکەوتوو کەوت، کە بوونە جێگەی سەرســامی لای خــاوەن کار، بەڵام لە ناکاو لە کاتی گەرانەکەیاندا بە ناو بەشەکانی کارگەکەدا زەنگی پشــوودان لێدرا، ئەم پیاوە سەیری کرد نزیکەی (٤٠٠٠) کرێکار کارگەکە جێ دەهێڵن و بە خێرایی بەرەو دەرەوەی کارگە دەرۆن، بۆیــە هاواری کردو بــە بەڕێوەبەری کارگەی وت: وریابە کرێکارەکانت ڕایان کردو کارگەکەیــان جێهێشــت! بەڕێوەبەریــش بە ئارامییەوە وتی: نیگەران مەبە، دەگەڕێنەوە، پاش نیــو کاتژمێر بۆ جــاری دووهەم زەنگ لێدرایــەوە، ســەیری کرد بە هەمــان گورج و گۆلی پێشوو ســەرجەم کرێکارەکان بەرەو ناو کارگەو هەریەك بۆ سەر کاری خۆی گەرایەوە! پاش گــەران و پشــکنینی هەموو بەشــەکانی کارگە، بەڕێوەبەر لە خاوەنکاری پرسی: بەڕێز دوای سەردان و گەڕان بە ناو هەموو بەشەکانی کارگەو بینینی تەواوی ئامێرەکانی کارگە، بە نیازیت کام ئامێرە بکڕیــت؟ خاوەنکارەکەش بەوپەڕی متمانە بــە خۆبوونەوە وتی: تەنها دەمەوێت ئەو زەنگە بکڕم.



## پەلە مەکە




لە یەکێــك لە ڕۆژە گەرمەکانــی هاویندا بانکــی (.......) لــە ڕادەبــەدەر قەرەباڵغ بوو، خەڵکێکی زۆر ریزیان گرتبوو چاوەڕانی چوونە ژوورەوەیان دەکرد، کــەش و هەواش زۆر گەرم بوو، لــە ناکاو پیاوێك زۆر بــە خێرایی خۆی کرد بە ناو بانکاو ریزەکەی تێپەڕاندو چوو بۆ لای یەکێك لە فەرمانبــەرەکان، (وەکو ئەوەی کەسی نەبینیبێ لەو ریزەدا یان زۆر دەمێکە لە ریزەکەدا وەســتاوەو ئارەقێکی زۆری کردووەو ئێستا گەیشووەتە لای فەرمانبەرەکە)، زۆر بە ســانایی پێی وت: بەڕێز ئەتوانی ناونیشــانی حسابەکەم بۆ بگۆڕیت؟

فەرمانبەرەکــەش زەردەخەنەیەکی کردو زۆر بــە هێمنــی وتی: ئەی بۆ نــا، بە چاوان، بەڵام لــە ڕێگای ئەو ریزەوە کــە لە بەردەمتا وەســتاون و عەیامێکــە چاوەڕوانــی هاتنــە ژوورەوە دەکەن!

# کێ دەیەوێت ببێتە سەرکردە؟!

ئا/ مودریك عەلی عارف

خەسڵەتە پێویستەکانی کەسێتی سەرکردە: سەرکردە کێیە؟ ئایا چۆن دەتوانین ببینە سەرکردەیەکی لێهاتوو؟ خەسڵەتە پێویستەکانی کەسێتی سەرکردە کامانەن؟ سەرکردەی شارەزاو سەرکەوتوو کێیە؟ چۆن دەتوانین ببینە سەرکردەیەکی سەرکەوتوو؟ ئەی چۆن ببینە سەرکردەیەکی خۆشەویست؟ ئایا دەتەوێت خەڵکی گوێ لە راوبۆچوونەکانت بگرن‌و پەیڕەویت لێ بکەن؟ ئایا هەست بەوە دەکەیت کە دەتوانیت ببیتە کەسێکی سەرکردەو بەشێوەیەکی باش‌و جوان خەڵکی ئاراستە بکەیت؟

ئەمانەو چەندین پرسیاری دیکە لەو پرسیارە گرنگانەن کە ئەو کەسەی کە دەیەوێت ببێتە سەرکردەیەکی لێهاتوو پێویستە لەخۆی بگات‌و بەشوێن وەڵامەکانیاندا بگەڕێت، هەڵبەتە تەنها گەڕان بەس نییە، بەڵکو وردبوونەوەو قوڵبوونەوە لە حەقیقەتی کەسێتی سەرکردەیەکی واقیعی زۆر پێویستە.

لێرەدا هەندێك لەو خەسڵەتە پێویستانەی کەسی سەرکردە دەخەینە روو، بەو هیوایەی کە خوێنەری بەڕێز سودو بەهرەی پێویستیان لێ وەربگرێت:

١- کەسێتی: سەرکردایەتی کردن‌و سەرکردەبوون ئەو تواناو ئیرادەیەیە کە ژنان‌و پیاوان بۆ دەستخستنی ئامانج‌و مەبەستێك دەخاتە رێ، هەروەها سەرکردایەتی کردن خواست‌و تێڕوانینێکە کە باوەڕ بەخۆبوون‌و دڵنیایی دەبەخشێتە دڵی مرۆڤەکان.

٢- جازیبەو هێزی راکێشان: لەبری ئەوەی کە بەو شێوەیە بکەیت خەڵکی لەبارەی تۆوە باش‌و بەشێوەیەکی ئیجابی بیربکەنەوە، هەوڵبدە کە خۆت کارێك بکەیت کە ئەوانیش لە بارەی خۆیانەوە باش بیربکەنەوەو هەستێکی باشیان بەرامبەر بەخۆیان بۆ دروست ببێت.

٣- پەیمان‌و بەڵێن: خەڵکی شوێنی ئەوکەسانە ناکەون کە بەڵێن‌و پەیمانەکانیان نابەنە سەر، کەسێك کە زۆرترین سودو بەهرە لە کاتەکانی دەبات ژیانی ئەمرو جاویدانی دەبێت.

٤- پەیوەندی: بەدیهێنانی تواناو لێهاتووییەکانی پەیوەندییە بالاًکان بۆسەرکردایەتی کردنێکی کاریگەر، پێویستییەکی بەڵگە نەویستە.

٥- دەسەڵات‌و سەلاحییەت: هەبوونی دەسەڵات‌و سەلاحییەت لە وتەو قسە باشترە، کەسی سەرکردە پێویستە ئەوە بزانێت کە چی بڵێت؟ چۆن بەرنامە رێژی بکات؟ چۆن پلان‌و بەرنامەکەی ئەنجام بدات تاوەکو خەڵکی بزانن کە سەرکردەیەکی لێزان‌و لێهاتووەو ئەو شعورو هەستەیان بۆ دروست ببێت کە شوێنی بکەون؟

٦- ئازایەتی‌و بوێری: ئازایەتی لەزۆرینەدایە، ئازایەتی ئەوەیە کە تەسلیم نەبیت‌و بەچۆکدا نەیەیت‌و نەترسیت لە قسەکردن‌و رووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ بەرامبەرەکان‌و هەروەها بتوانیت بە شێوەیەکی باش‌و ژیرانە هەنگاوی بوێرانە هەڵگریت بۆ داهێنان‌و گۆڕانکاری.

٧ - بەصیرەت‌و بەرچاوڕوونی: سەرکردە بەئاگاو هۆشیارەکان تەنها قەناعەت‌و باوەڕ بەنیوەی ئەوشتانە دەکەن کە دەیانبیستن، بەڵام سەرکردە بەرچاو روون‌و خاوەن بەصیرەت‌و بە فیراسەتەکان دەزانن کە کام نیوەی قسەکان پەسەند بکەن.

٨ - سەرنجدان‌و بایەخ پێدان: سەرنجدان‌و بایەخ پێدانت هەرچەندە وردترو دەقیقتر بێت ئەوا لە بەرنامەو کارەکانی ژیانتدا سەرکەوتووتر دەبیت، بەڵام ئەگەر لە یەك شوێن‌و کاتدا بتەوێ کە دوو کار یان دوو مەبەستی جیاواز دەستبخەیت ئەوا بە دڵنیاییەوە هەردووکیان لەدەست دەدەیت.

٩- بەخشندەیی‌و سەخاوەت: مۆم‌و چراکەی تۆ کاتێك کە مۆم‌و چرایەکی دیکە دادەگیرسێنێت ئەوا هیچ شتێك لەدەست نادات، ئەوەش بزانە کە خەڵات‌و پاداشت بە کەسێك نادرێت کە شتێکی وەرگرتووە، بەڵکو پاداشت‌و خەڵات بۆ کەسێکە کە شتێکی بەخشیوە.

١٠- داهێنان‌و ئافراندن لە کاردا: وا دەردەکەوێت کە سەرکەوتن پەیوەستە بە کارکردنەوە، وتراویشە کە: «مرۆڤە سەرکەوتووەکان بەردەوام دەبن لە رۆشتندا، هەڵە دەکەن بەڵام ناوەستن».

١١- گوێ لێگرتن: بۆ پەیوەندیکردن لەگەڵ دڵی خەڵکیدا، سود لە گوێکانتان وەربگرن، «گوێی کەسی سەرکردە پێویستە بە دەنگی خەڵکی زەنگ لێبدات‌و بزرنگێتەوە».

١٢- حەزو تاسەو تامەزرۆیی: بە پێشوازی ژیانەوە برۆو عاشقانە ژیانت خۆش بووێت، کاتێك سەرکردەیەك تامەزرۆیانە لەگەڵ خەڵکیدا مامەڵە دەکات، ئەوانیش بە حەزو تامەزرۆییەوە وەڵامی

دەدەنەوە.

١٣- تێڕوانینی ئیجابی: ئەگەر باوەڕت بەوشێوەیە بێت کە دەتوانیت، ئەوا دڵنیابە کە دەتوانیت: «سەرکردەو مرۆڤی سەرکەوتوو ئەو کەسەیە کە بە ئەو بەردو لەتە خشتانەی کە خەڵکی تێیدەگرن، کۆڵەکەو پایەیەکی بەهێز دروست دەکات».

١٤- چارەسەرکردنی کێشەو مەسەلەکان: هەر سەرکردەیەك بەدوای چارەسەری ئەو کێشەو گرفتانەدا دەگەڕێت کە لە سنووری بازنەی کاری خۆیدان‌و، بەشوێن وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەگەڕێت کە: ئایا پێشتر ئەم کێشەیەم هەبووە یان نا؟

١٥- پەیوەندییەکان: ئەگەر تۆ پەیوەندیت لەگەڵ خەڵکیدا باشبێت، ئەوا ئەوانیش پەیوەندییان لەگەڵ تۆدا باش دەبێت، ئەوەش بزانە کە بەلای خەڵکەوە گرنگ نییە کە تۆ چەنێك شت دەزانیت؟ بەڵکو ئەوە بەلایانەوە گرنگە کە تۆ چەنێك بایەخیان پێدەدەیت: «گرنگترین پایەی سەرکەوتن ئەوەیە کە بزانین چۆن‌و بە چ شێوەیەك لەگەڵ خەڵکیدا بژین‌و مامەڵە بکەین؟»

١٦- بەرپرسیارییەتی: ئەگەر نەچیتە ناو چاڵەوە ئەوا ناتوانیت سەرکردایەتی خەڵکی بکەیت: «کەسی سەرکردە دەتوانێت هەموو شتێك لەدەستبدات بێجگە لە دوایین بەرپرسیاریەتی».

١٧- دڵنیایی: سەرکردەیەك کە بیەوێت خۆی هەموو کارەکان ئەنجام بدات‌و هەموو شانازییەکان بۆخۆی بێت، ئەوا ناتوانێت ببێتە سەرکردەیەکی گەورە.

١٨- ڕێکوپێکی‌و پابەندبوونی کەسی: یەکەم کەسێك کە تۆ ڕێبەری‌و سەرکردایەتی بکەیت خودی خۆتی، وەك چۆن یەکەمین‌و بەرزترین سەرکەوتن: زاڵبوون‌و سەرکەوتنە بەسەر خودی خۆتدا.

١٩- خزمەتگوزاری: بۆ ئەوەی پێشکەویت، خەڵکی لەپێش چاو بگرەو بیانخەرە پێشەوە، چونکە سەرکردەی واقیعی خزمەتگوزارەو شوێنکەوتووەکانی بەچاوێکی زیاتر لە پلەو پایەیان دەبینێت‌و خۆشی دەوێن.

٢٠- فێرخوازی: بۆ بەردەوامی بەخشین بە سەرکردە بوونت درێژە بە فێرخوازی بدە: «دە بەرامبەری ئەوەی کە قسە دەکەیت بخوێنەرەوەو گوێ بگرە».

٢١ ـ دووربینی زەینی: ئازایەتی‌و دلێری‌و بوێری سەرکردەیەکی گەورە بۆ گەیشتن‌و بەرجەستەکردنی ئامانجەکانی، بەهۆی حەزو تاسەو تامەزرۆیی بوونیەوەیەتی نەك بەهۆی ئەو پلەو پایەیەی کە هەیەتی.

سەرچاوە/ کتێبی: صفت های بایسته یك رهبر، نووسینی: جان ماکسول.

هونەری کۆبوونەوە

زنجیرەی چواردەم



# ١٨ ئامۆژگاری بۆ بەڕێوەبردنی گفتوگۆ

ئەمە (١٨) ئامۆژگارییە پێویستە سەرۆکی کۆبوونەوە ڕەچاوی بکات‌و پیادەی بکات بۆ سەرکەوتن لە بەڕێوەبردنی گفتوگۆی نێو کۆبوونەوە:

١-ڕەخنە وەربگرە.

٢-هەمیشە یەکەم قسەکەر مەبە.

٣- کەش‌وهەوای کۆبوونەوە بپارێزەو نەرم‌و نیانبەو کەسێکی وشك‌و ڕووگرژ مەبە.

٤-گفتوگۆ بوەستێنە ئەگەر دووبارە بوونەوەی تێدا بوو.

٥-گفتوگۆ ئاراستە بکە ڕووەو ئامانج.

٦-کەس مەشکێنەو لە ڕێزی کەس مەهێنە خوارەوە.

٧-هەوڵ بدە کە کۆبوونەوەکە لە بەیانیدا یا لە کاتی چالاکیدا ببەسترێت، وریابە لە کاتی نیوەڕۆ یا نیوەشەودا نەبێت.

٨-ئەو کەسانەی کە بەشداری ناکەن هانیان بدە بۆ بەشداریکردن، ئەویش بە ئاوردانەوە بۆ لایان، یا بە ناوهێنانیان، یا بە ئاراستەکردنی پرسیار.

٩-هەرگیز ڕێگە بە کۆنترۆڵکردنی کۆبوونەوەکە مەدە لە لایەن یەکێك لە بەشداربووانەوە.

١٠-با کورسیەکان بە شێوەیەك دانرابن کە ئەندامان بە ئاسانی یەکتری ببینن، هەروەها با ژمارەی کورسیەکان هێندەی ژمارەی ئامادەبووان بێت، چونکە کورسی چۆڵ کاریگەری نێگەتیڤی دەبێت لەسەر دەروونی ئامادەبووان.

١١- درێژدادری مەکە لە قسەکردنداو زۆر قسەکانت درێژ مەکەرەوە لە کاتی گفتوگۆو ڕاگۆڕینەوەدا.

١٢- هەمیشە گوێگرێکی باشبە.

١٣-بەردەوام ئاراستەی کۆبوونەوەکە بکەو ڕێگە مەدە گفتوگۆ بگاتە ڕێگایەکی داخراو.

١٤- ئازادیی دانیشتن‌و هەڵسان‌و جووڵە بدە بە بەشداربووان.

١٥- داوا لە بەشداربووان بکە لە کاتی قسەکردندا لەبەر قسە بکەن‌و لەبەر کاغەز شت نەخوێننەوە.

١٦- هەوڵ بدە ڕووناکی هۆڵی کۆبوونەوە تەواو بێت‌و گەرماو سەرمای گونجاو بێت.

١٧- پەنا مەبە بۆ دەنگدان تا ئەو کاتەی گفتوگۆ تەواو دەبێت‌و ئەلتەرناتیڤەکان زۆر کەم دەبن.

١٨- بەردەوام چاودێری گرنگیدان‌و گرنگینەدان بکە.

سەرچاوە: فن الادارة الاجتماعات - د. علي الحمادي — دار ابن حزم.

# نهێنی سەرکردایەتی لەسی و یەك ڕۆژدا

و. له فارسییەوە: ئاری محمد

★ ڕۆژی بیستو پێنجەم: نهێنی سەرکردایەتی لەوەدایە کە ئارەزووت بۆ جێبەجێکردنی کارەکان زیاتربێت، لە ئارەزووت بۆ زانینی ئەنجامو ئاکامی کارەکان.

★ ڕۆژی بیستو حەوتەم: نهێنی سەرکردایەتی لەوەدایە کە وەك هێزێکی پاڵنەری بەهێز وابیت بۆ ئەوەی هانی ژێر دەستەکانت بدەیت بۆ ئەوەی باوەڕیان بەو لێهاتووییانە هەبێت کەلەهەر تاکێکیان دا هەیە.

★ ڕۆژی بیستو دووەم: نهێنی سەرکردایەتی لەوەدایە کە هەمیشە داواکاری یارمەتیو هاوکاری بیت لە کەسانی ژێردەستت نەك ئەوەی کە سور بیت لەسەر داوای گوێڕایەڵی کردن لێیان.

★ ڕۆژی بیستو سێیەم: نهێنی سەرکردایەتی لە ڕادەی حەزوئارەزوو دایە سەبارەت بە جێبەجێکردنی کارەکانت.

★ ڕۆژی بیستو شەشەم: نهێنی سەرکردایەتی لەوەدایە کە هەمیشە بە گەشبینییەوە لە ئەنجامو ئاکامی کارەکانت بڕوانیتو باوەڕت وابێت کە سەرەنجام هەر سەرکەوتوو دەبیت.

★ ڕۆژی بیستو چوارەم: نهێنی سەرکردایەتی لەوەدایە کە کارەکانی بەباشترین خولیاو ئامانج ئەنجام دەدات، بەردەوام چاوەڕوانی ئەنجامی باش بێت.

★ ڕۆژی بیستو نۆیەم: نهێنی سەرکردایەتی لە خۆشویستنی کەسانی تردایە دەبێت خۆتیان لێ جیانەکەیتەوە، بە هاوبەشیان بزانیت لەو ڕاستیەی کەلە دەرونت دایە.

★ ڕۆژی بیستو یەکەم: نهێنی سەرکردایەتی لەوەدایە کە خۆشویستن یاخود ڕقو کینە کاریگەرییان لەسەر بیرکردنەوەو بڕیارەکانت نەبێت.

★ ڕۆژی بیستەم: نهێنی سەرکردایەتی لەوەدایە کە زیاتر لە ئەنجامی کارەکان، ئەنجامدەری کارەکانت بەلاوە گرنگتربێت، لە بیرت بێت کە گروپێکی چالاكو لێهاتوو توانای بەرهەمهێنانی بەرهەمی جۆراوجۆریان هەیە.

★ ڕۆژی پازدەیەم: نهێنی سەرکردایەتی لەوەدایە کە هەمیشە لە هەوڵی دۆزینەوەی چارەسەردا بیت.

★ ڕۆژی پێنجەم: نهێنی سەرکردایەتی لەوەدایە کە لایەنگری ڕاستی بیت، لە بیرت بێت کە براوەی کۆتایی تەنها ڕاستییە.

★ ڕۆژی حەڤدەیەم: نهێنی سەرکردایەتی لەوەدایە کە کەسانی دەوروبەرت لە دروشمو ئامانجەکانت بێبەش نەکەیتو بەردەوام بە هاوڕێی خۆتیان بزانیت تاوەکو پارێزگاریت لێ بکەن.

★ ڕۆژی حەوتەم: نهێنی سەرکردایەتی لەوەدایە کە بیرکردنەوەو هەستێکی هاوسەنگو فراوانت هەبێت، لە کاتی سەرکەوتندا لەخۆبایی‌و، لە کاتی شکستدا نا ئومێد نەبیت.

★ ڕۆژی دەیەم: نهێنی سەرکردایەتی لەوەدایە کە بەرژەوەندی خەڵك پێش بەرژەوەندی خۆت لە پێش چاو بگریت.

★ ڕۆژی دوازدەیەم: نهێنی سەرکردایەتی لەوەدایە کە کاروکردەوەکان بەوشێوە وەربگریت کە هەیە نەك بەو شێوەیەی کە دڵت دەیەوێت.

★ ڕۆژی دووەم: نهێنی سەرکردایەتی لە بەبیرهێنانەوەی ئەو یاسایەدایە کە دەڵێت: ((مرۆڤەکان لە کاڵاو کەرەستەکان بەهاو نرخیان زیاترە)).

★ ڕۆژی سی یەم: نهێنی سەرکردایەتی لەوەدایە کە دڵ فراوان بیت نەك ئەوەی کە کینە لە دڵ بیت سەبارەت بە ژێردەستەکانت.

★ ڕۆژی سیازدەیەم: نهێنی سەرکردایەتی لەوەدایە کە بەباشترین شێوە سود لەتواناو لێهاتووی کەسانی تر وەربگریت، بەو شێوەیە بیر نەکەیتەوە کە ئەگەر لێهاتوویەکان بە جۆرێکی تر بووایە باشتر دەبوو.

★ ڕۆژی سێیەم: نهێنی سەرکردایەتی لەوەدایە کە ڕاستگۆو دڵسۆز و ڕووخۆش بیت لە گەڵ ژێردەستەکانتدا، چاوەڕوانی دەست پێشخەری ئەوان نەبیت.

★ ڕۆژی شازدەیەم: نهێنی سەرکردایەتی دەربازبونە لە شتە کۆنەکان، کارێك ئەنجام بدە کە بەڕاستی دروستو تەواوە تەنانەت ئەگەر کەسانی تر هەزاران جار ئەنجامیان دابێت هێشتا هەر نوێیە.

★ ڕۆژی شەشەم: نهێنی سەرکردایەتی لەوەدایە کە هەمیشە ئامانجی کۆتایت لە بەرچاو بێت. ((هەمیشە پرسیار لە خۆت بکەیت کە بە ڕاستی ئێمە دوای چی کەوتووینو ئامانجمان چییە؟)).

★ ڕۆژی چوارەم: نهێنی سەرکردایەتی لەوەدایە کە پلەوپایەو دەسەڵاتو گرنگی جێگایەکەت لە گەڵ کەسانی تردا دابەش بکەیت، خۆشت بە هاوبەشی کێشەکانیان بزانیت.

★ ڕۆژی چواردەیەم: نهێنی سەرکردایەتی لە دووربینیو دوور ئەندێشی دایە "تیروانینت بۆ شوێنێك بێت کە لە توانای بینین دانییە".

★ ڕۆژی نۆزدەیەم: نهێنی سەرکردایەتی لەوەدایە کە ئەو بنەما ڕاستو دروستانە لەخۆشویستنو میهرەبانی بەکاربهێنیت.

★ ڕۆژی نۆیەم: نهێنی سەرکردایەتی لەوەدایە کارێك کە خۆت ئارەزوی ئەنجام دانیت نییە داوای جێبەجێکردنی لە کەسێکی تر نەکەیت.

★ ڕۆژی هەشتەم: نهێنی سەرکردایەتی لەوەدایە کە تواناو لێهاتوییەکانت لە کارێکدا بەکاربێنی کە جێبەجێی دەکەیت نەك لە خۆت دا وەك جێبەجێ کاری کارەکە.

★ ڕۆژی یازدەیەم: نهێنی سەرکردایەتی لەوەدایە کە گوێ لەبیروبۆچونی خەڵك بگریتو ڕێز لە بیرۆکەکانیان بگریت.

★ ڕۆژی یەکەم: نهێنی سەرکردایەتی لەوەدایە کەپلەوپایە بە هۆکارێك بزانی بۆخزمەتکردنی خەڵك، نەك ئەوەی کە پلەی خۆت لای هەموو کەسێك بدرکێنیو بە ڕووی هەموو کەسێکی دا بدەیت.

★ڕۆژی بیستو هەشتەم: نهێنی سەرکردایەتی لەوەدایە کەلە کارەکانتدا هێزی ڕابەرایەتیو ئاخاوتنی جوان بەکاربهێنیت، دڵیشت ڕێنیشاندەرت بێت.

★ڕۆژی سیو یەکەم: نهێنی سەرکردایەتی لە قسە خۆشیو ڕووخۆشیو ئاخاوتنی جوان دایە "هەمیشە لە گەڵ خەڵك پێ بکەنە، بەڵام هیچ کات بە خەڵك پێ مەکە نە".

★ڕۆژی هەژدەیەم: نهێنی سەرکردایەتی لەوەدایە کە پابەندبیت بە بنەمایەکی ڕاستو دروستەوە، بیرۆکەی کەسانی تریش لەبەرچاو بگریت.

سەرچاوە: گۆڤاری"اطلاعات علمي". ژمارە:١١ "لاپەڕە:٢٤-٢٥"

سکرتاریەت

زنجیرەی دوازدەیەم

# سکرتێرو پەیوەندیکردنی کارگێڕی ٢/٢

ئا/ عومەر عەبدولقادر

★ کارامەییەکانی پەیوەندیکردن:

بۆ ئەوەی پرۆسەی پەیوەندیکردن بە کارایی بەڕێوە بچێت پێویستە سکرتێر خاوەنی کارامەییەکانی پەیوەندیکردن بێت کە ڕۆڵی گرنگ و سەرەکی دەبینن لە سەرکەوتنی پرۆسەکەدا، لە گرنگترین ئەو کارامەییانەش:

١- کارامەیی خوێندنەوە:

- پشکنین بۆ چاوەکانت ئەنجام بدە، ئەگەر پێویستت بە چاویلکە بوو بەکاری بهێنە.

- تەکنیکەکانی خوێندنەوە فێرببە، چاوت بەناو دێرەکاندا مەگێرە، لە هەمان کاتدا ئەو وشانەی کە زۆر گرنگن چەند جارێك بیانخوێنەرەوە.

- زیاتر ئامانج یان مەبەستەکە بخوێنەرەوە، بەشێوەیەکی کوێرانە بە لاپەرەکەدا مەڕوانە، بەدوای ئەو بەشەدا بگەڕێ کە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بەتۆوە هەیەو لە خۆت بپرسە بۆچی ئەوە دەخوێنیتەوە؟ پێشبینی دەکەیت لە خوێندنەوەی ئەوەدا بگەیت بەچی؟

- بەدوای بیرۆکەی سەرەکیدا بگەڕێ، ڕوانینت لەسەر بیرۆکە سەرەکیەکان چڕبکەرەوە کە دەکرێت کورت بکرێنەوەو جیابکرێنەوە، هەوڵبدە ئەو بیرۆکانە بە باشی بخوێنیتەوە.

- خۆت بەدووربگرە لە نەریت و خووە خراپەکان و خۆتیان لێ بپارێزە:

أ- خوێندنەوەت لە تەنها دێڕێکدا چڕمەکەرەوە.

ب- چاوەکانت بۆ ماوەیەکی درێژ لەسەر دێڕێك ڕامەگرەو دێڕەکانی تر فەرامۆش بکەیت.

ج- دووبارە مەچۆرەوە سەر خوێندنەوەی ڕستەو دەستەواژەکان.

د- لە کاتی خوێندنەوەدا لە گەڵ خۆت مەدوێ.

٢- کارامەیی نووسین:

- وشەو دەستەواژەی ئاڵۆزو گران بەکارمەهێنە.

- چەندێك دەتوانیت هەوڵبدە تێگەیشتن لە پەیامەکە ئاسان بکەیت.

- بیرۆکەکان بە شێوازێکی نوێ دابڕێژەو بەجوانی ڕیزبەندیان بکە، دڵنیابە لەوەی هەڵەو کەموکورتی تێدا نەبێت لە ڕووی ڕێزمان و ڕێنووسەوە.

- بەباشی ئاستی فێرکاری و ڕۆشنبیری ئەو کەسە بزانە کە لە پەیامەکەدا دەیدوێنیت.

- تێبینی ئەو ئاستە کارگێڕییە بکە کە دەتەوێت پەیامەکەی بۆ بنووسیت.

٣- کارامەیی بێدەنگبوون و گوێگرتن:

- لە کاتی گفتوگۆدا بەدوای ئەو بوارانەدا بچۆ کە بۆ تۆ گرنگن.

- سەرنج لە ناوەڕۆکی بابەتەکە بدە نەك لەو ڕێگەو شێوازەی کە پێی دەدوێن.

- بە نەرمونیانییەوە گوێ بگرە بۆ سەرجەم دیدو بۆچوون و بیرۆکەکان چ ڕاست و دروست بن یا هەڵەو ناڕاست بن و گوێگری تەنها دیدو بۆچوونێك مەبە.

- تا گفتوگۆکە تەواو نەبێت و کۆتایی پێ نەیەت هیچ بڕیارێك مەدە.

- بەسەرنجدان و وردبوونەوەوە گوێبگرەو هەوڵی خۆت لەو پێناوەدا بخەرە گەڕ.

- دووربکەوەرەوە لە هەر شتێك کە سەرنجت دەشێوێنێت.

- کاریگەر مەبە بە وشەو دەربڕینی هەست بزوێن و سۆزداری.

- گوێبگرە بۆ سەرجەم گفتوگۆو وتەکان چ تێگەیشتنیان ئاسان بێت یاخود گران.

- لە کاتی بێدەنگبووندا بیربکەرەوەو ئەوەی لەبەردەمتدا دەوترێت هەڵی بسەنگێنە.

٤. کارامەیی گفتوگۆکردن:

- خۆت ڕێکبخەو وا بێنە پێش چاوت کە کەسێك قسەت لە گەڵ دەکات، ئاگاداربەو بزانە دەڵێیت چی؟

- بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ لەبارەی کاروبارەکانەوە بدوێ، ئامانجی سەرەکیت *لە گفتوگۆکەدا چییە؟ ئەو بابەتە چییە* کە دەتەوێت لە بارەیەوە بدوێیت؟ بە باشی تەوەرەکانی دەستنیشان بکە.

- لۆژیکی بەو هەوڵ مەدە بە شێوەیەکی هەڕەمەکی لە بابەتێکەوە بچیتە سەر بابەتێکی تر بەبێ ئەوەی هیچ پەیوەستییەکی لۆژیکی لە نێوانیاندا هەبێت.

- بنووسە، تەنها پشت بە یادەوەریت مەبەستە، با بەردەوام یاداشتەکانت و کاغەزو پێنووسی پێویست لەبەردەستتدا بێت.

- پێشبینی نەرێنی و بەرپەرچدانەوە بکە لە لایەن گوێگرانتەوە.

- قسەبکەو مەخوێنەرەوە، چونکە خوێندنەوە ئاماژەیەکە بۆ دڵنیانەبوونت لە زانیارییەکانت هەرچەندە لێدوانەکەت وا دەربخات کە دڵنیایت لەوەی بابەتەکە بە باشی دەزانیت.

- دەروونت جێگیر بکەو بەپەرۆش و تامەزرۆبە لە کاتی لێدوانەکەتداو بەروون و ئاشکرایی بدوێ بۆ ئەوەی گوێگرانت بە باشی لێت تێبگەن.

- ماوە ماوە وچانێك بدە، چونکە بەردەوامبوونی لێدوانەکەت لەسەر یەك شێوازو بەبێ وەستان کاردەکاتە سەر کارایی پێشکەشکردنی بابەتەکەت.

## ١١٣ شێوازو ڕێگا بۆ یارمەتیدانت لەسەر بەرزکردنەوەی ڕێژەی بەرهەمهێنان و زاڵبوون بەسەر ڕێچکەی دواخستندا

# چۆن زۆرترین بەرهەم لە کەمترین کاتدا بەدەست دێنیت؟

بەشی سێیەم

ئێستا دەست پێ بکە:

٣٤- ئەمرۆ هەڵسە بە دانانی لیستێك بۆ بەیانی، چونکە زۆربەمان کەمترین بەرهەمی دەبێ لە کۆتایی ڕۆژدا، کاتێك کە زۆربەی ئەرکە قورسەکانی ئەمرۆژە تەواو دەبێت، کاتی خۆئامادەکردنە بۆ ڕۆژی دواتر، وا باشترە کە پابەندبی بە خشتەیەك بۆ کارەکان لە فایلی ڕۆژانە، یان کۆیان بکەیتەوە لە شێوەی نامیلکەیەك بەم شێوەیە هەموو کارو چالاکیەکانت لەبەردەم دابێت، سازکردنی خشتەی کارەکانت لە پێشدا بێت، بۆ ئەوەی ڕۆژی دواتر بە باشترین شێوە دەست پێبکەیت، ئەمەش وات لێدەکات کە بیر بکەیتەوە لە هەنگاوەکانی تری.

٣٥- هەموو بەیانییەك لە نووسینگەی پاکەوە دەست پێبکە، ئەمەش لە ئێوارەدا پێش دەرچوونت لە کار هەڵسە بە پاککردنەوەی کەڵەکە بوونی کارەکان، بەردەوامیشت لەسەر پاککردنەوەی نووسینگەکەت وەکو خوویەکی ڕۆژانەی لێدێت لە هەر تەنگژەیەك دوورت دەخاتەوە کە دەبێتە هۆی پەرش و بڵاوی و ڕێگر دەبێت لەبەردەم بیرکردنەوەی داهێنەرانە، زۆربە سانایی ناتوانی کارەکانت بە شێوەیەکی دروست بەئەنجام بگەیەنی ئەگەر نووسینێکی زۆرت لەسەر کەڵەکەبوو، لە گەڵ بوونی کۆمەڵێك کار کە دەبێت لەیەك کاتدا جێبەجێ بکرێت.

٣٦- ئەنجامدانی ئاستەمترین کار، ئەمەش لە کاتێك کە لیستێکی بەرفراوانت هەیە لە کاری قورس، هەڵسە بە ئەنجام گەیاندنی هەرە سەختەکەیان لە دوایدا هەست دەکەیت بە ئاسانی کارەکانی ترو دەربازبی لە خەفەت خواردن بۆ هەموو ڕۆژەکە.

٣٧- ئێستا دەست پێبکە، هەردەم ئەم دەستەواژەیەت لەبەر چاو بێ "ئێستا کارەکەت بەئەنجام بگەیەنە" چونکە تا دەست پێنەکەیت کۆتایی نایەت، چاوەڕوانی ڕێکخستنی هەندێك کار ئەگەری لە دەستدانی هەموویەتی، بە ئەنجام گەیاندنی هەندێ هەنگاو ڕۆژانە دەتگەیەنێتە ئامانجت، کارەکانت دوامەخە ئێستا دەست پێبکە.

٣٨- وردبین بە، پەرە بەوردبینی وادەو بەڵێنەکانت بدە دەبێتە خوویێك کە لە ماوەیەکی کورتدا زۆرترین کار بە ئەنجام دەگەیەنی لەچاو کەسانی تر بە ڕێژەی (٩٧٪)، وردبینی و پابەندبوون بە بەڵێن وادەکات هەردەم کات و پارەت بۆ بگێڕێتەوە، لە هەمان کاتدا ڕێزی کەسانی تر بگریت، زوو ئامادەبوونت لە کار دەرفەتی ناسینی کارمەندان و کۆمەککردنی نوێت پێ دەبەخشێ، لە هەمان کاتدا دەرفەتی حەسانەوەو کاتی خۆ ئامادەکردن بۆ بیرکردنەوەت یان هەر هیچ نەبێت کاتێکت بۆ پێداچوونەوەی تێبینیەکانت پێدەدات.

٣٩- سوود لە سەرەتای ڕۆژە زووەکان وەربگرە، کاتژمێرێك لە وادەی دیاریکراو زووتر لە خەو هەڵسەو ئەم کاتژمێرە بقۆزەرەوە بۆ بە ئەنجام گەیاندنی بە باشترین شێوە، بۆ ماوەی مانگێك لەسەری بەردەوام بەو سەرت سوڕدەمینێ لەوەی کە ئەم کاتژمێرە بۆتی کردووە، ئەمە شێوازێکی سانایە بۆ دەست خستنی سوودی زۆرباش.

٤٠- هەموو پڕۆژەیەك بە هەنگاوێکی باش دەست پێبکە، دەست بکە بە کارێکی گرنگ و هەست بە بەئەنجام گەیاندنی دەکەیت کە یارمەتیدەرە بۆ تەواوکردنی ڕۆژەکەت لیستی ڕۆژانەت دەست پێبکە بە ئەرك یاخود کارە سانایەکان و دانانی پلانێکی دوورو درێژ بۆ کارە زۆر زەحمەتەکان، ئەمەت لە بیر بێت لەسەرەتای هەر کارێك یان پڕۆژەیەك و بە سەرکەوتوویی هەموو جارێك دەست پێدەکەیت.

بیرکردنەوەی بەرهەم هێنەرانە دابهێنە:

٤١- ئەگەر کاتی ترت هەبوو کاری بۆ بکە لەسەر هەنگاوە هەرە گرنگەکەی، لەبەرئەوەی ئەوەیە کە نرخێکی زۆرترت پێدەدات، یان داهاتێکی گەورەتر، پرسیارێك کە پێویستە بەردەوام لە خۆتی بکەیت (باشترین وەبەرهێنان بۆ کاتی ئێستام چییە؟) لەو کاتەدا هەڵسە بە بەئەنجام گەیاندنی زۆرترین کاری بەرهەم هێنەر.

٤٢- بەردەوام تیشك بخەرە سەر هەر هەنگاوێکی فەرامۆش کراوی کە گرنگ بێت، بە بەردەوامی کاری بۆ بکە، هەتا دەتوانی بەبێ پچڕانی بیرو هۆشت لەسەری، گرنگ نییە تا چەند ئاستەم و قێزەونە و یان ئەوانەی کە ڕووبەڕووت دەبنەوە، کە زۆربەی جار پێویست دەکات کە خاوەن ئیرادەیەکی بە هێزبی، چونکە دەرەنجامەکەی شایەنی ئەم ماندووبوونەیە.

٤٣- بچۆرە سەر هەنگاوی داهاتوو لە گرنگی لیستەکەت، هەموو بیرو هۆشی خۆت ١٠٠٪ بدە ئەم کارە تا تەواو دەبێت، کە تەواو بوویت یان ئەوپەڕی توانای خۆت خستە گەڕ بۆی، بگوێزەرەوە بۆ سەر کارەکەی دوای ئەو لە سەر لیستەکەت یەك بە دوای یەکدا، ئا بەم شێوەیە کارەکانت کۆتایی پێبێنە و هەموو کات کاربکە بۆ بەئەنجام گەیاندنی هەرە گرنگەکەیان.

٤٤- ئەوکارە بە ئەنجام بگەیەنە کە داهاتێکی زۆرت بۆ دەستەبەر دەکات، کارە




سانایەکانیش بدە بەو کەسانەی کە دەتوانن پێی هەڵسن، ئەمەش باشترین شێوازە بۆ بەرزکردنەوەی تێکرایی بەرهەم هێنان، خۆت هەڵسە بە ئەنجامدانی کارە سەرەکیەکان، چونکە تەنها خۆت باشتر ئەنجامی دەدەی، هەرچەندە کە لێهاتوویی و لێزانیت هەبوو لەم بارەدا پێویستە کە بە شێوەیەکی زانستیانە کە ئەم کارە پێویستییەتی ئەنجامی بدە، کات و لێزانی خۆت بخەرە گەڕ، وردبین بە لە هەر کارێك و بڕیار بدە لەوەی کە کام توانای بەردەست زۆرتر چالاکترە بۆ ئەنجامدانی.

٤٥- کاتی خۆت بگۆڕە بۆ کردەوەی بەرهەمهێنەر، ئەم کاتە دیاری بکە کە دەتوانی زۆرترین بەرهەمی هەبێت، هەموو توانای خۆت کۆبکەرەوەو پاشان ئەنجامی بدە، کاتەکانی کە تیایدا بەرهەم هێنان کەم دەبێتەوە تەرخانی بکە بۆ وەڵامدانەوەی پەیوەندی تەلەفۆنی، ناردنی فاکس، کۆبوونەوە، یان گفتوگۆکردن، کەسیش ناتوانێت کە پارێزگاری بکات لەسەر تێکرایی بەرهەمی بەرز بە درێژایی ڕۆژ، نهێنییەکەش لەوەدایە کە زۆرترینی کاتە چالاکەکان بناسی و تیایدا هەڵسی بە ئەنجامدانی زۆرترین داواکاری و پێداویستییەکانی کارکردن.

٤٦- بە شێوەیەکی کارامە کۆمپیوتەر بەکاربهێنە، هەموو کات پابەندبە بە نووسینی شتەکان یەکەم جار و لە دوایدا دەتوانی بیخەیتە سەر نووسینگە، دوورکەوە لە نووسینی تێبینییەکانت بەدەست کە لەدوایدا دەبێ بیگەڕێنیتەوە بۆ سەر کۆمپیوتەرەکەت، هەوڵدە فێری بەکار هێنانی (بنەمای داتاکان) و هێڵکاری پرۆژەکان و هەر پرۆگرامێکی کە سوود بە کارەکانت دەگەیەنی.

٤٧- کاتی خۆت دەستەبەر بکە بە ئەنجامدانی ئەرکەکانت بە کەمترین زیان، تا هەنگاوەکانی کەمتربوون بە ئەنجام گەیاندنی باشتر دەبێت، کار بۆ بەرزکردنەوەی تێکرایی توانستت بە گێڕانەوەی دەقیقەو چرکەکان لە کارە دووبارە بووەکان، ئاگاداری هەنگاوی ئاڵۆز و ناگرنگ و ڕێژەکانیان بە بەچارەسەرکردنیان کە کارەکان دووبەرامبەر دەکاتەوە.

٤٨- قەبارەی کارەکانت جۆربە جۆر بکە تا دوورکەویتەوە لە ماندوویی، لە بری هەڵسان بە ئەنجامدانی دوو پرۆژە لە ماوەی چوار کاتژمێردا، یەك بەدوای یەك ئەنجامیان بدە، دابەشیان بکە بۆ ئەرك کە هەریەکەیان لە ماوەی ٣٠ خولەکدا ئەنجام بدەی، هەوڵبدە ئەرکەکانت ڕیز بکەیت لە بچوکەوە بۆ گەورە، لەو کاتەدا هەست بە ئەنجامدانی دەکەیت و کەمتر بێ تاقەتیت پێوە دیاردەبێ لە کۆتایی ڕۆژدا.

٤٩- ڕووبەڕووی خۆت بەرەوە بۆ کۆتایی هێنانی کارەکانت لە خشتەی کار، بە بەردەوام بگەڕێ بەدوای زۆرترین و باشترین و بە پەلەترین شێوازی بەرهەمهێنان بۆ ئەنجامدانی کارەکان لە دوایدا پاداشتی خۆت بکە بۆ بەرزکردنەوەی تێکرایی بەرهەم هێنانت.

٥٠- هەوڵی خۆت بخەگەڕ بۆ بەرزکردنەوەی تێکرایی چاککردن، چاککردنێکی کەم و بەردەوام لە کۆشش و دەرەنجام جیاوازی گەورە بۆ ماوەیەکی دوور دەستەبەر دەکات، هەموو ئەوەی کە پێویستیشە ئەوەیە کە کاری خۆت چاك بکەیت زیاتر لەوەی کە لەسەری دەڕۆی و بە بەردەوامی لەو کاتە دەگەیتە سەروو (٪٥) لە کرێکارە بەرهەم هێنەرەکان.

٥١- گەشە بە بەرهەمی کارەکەت بدە، کاری ئەمڕۆ مەخەرە سبەی، ئێستا دەست بە کارەکەت بکەو ئەوەی تۆ لە ماوەی ١٠ ساڵدا ئەنجامی دەدەی کەسانی تر بە هەموو تەمەنیان پێی دەگەن، ئێستا کارەکەت ئەنجامبدەو هەست بە ئەنجامێکی زۆرباش دەکەیت چۆنییەتی بەرهەمهێنانی کاتت جۆری ئەو ژیانە دیاری دەکات کە دروستی دەکەیت.

٥٢- زۆرتر ئەوە دیاری بکە کە دەتەوێ ئەنجامی بدەی لە هەر شتێکی تر، هەنگاوی یەکەم چییە لەسەر لیستەکەت، یان گرنگترین ئامانج کە دەبێ ئێستا بە ئەنجام بگەیەنرێت، ئەمە ئەو ئەرکەیە کە پێویستە لێی وردبینەوە، ئەم شێوازە پەیڕەو بکە لەو کاتەدا دەتوانی هەموو ئەوەی کە پێویستە ئەنجامی دەدەی بەڵام بە مەرجی کارکردن بۆ هەر کارێك بەجیا.

٥٣- هەڵسان بە زیادکردنی ئەنجامەکان بە چوونە سەر کارەکەی دوایی بەبێ دواکەوتن، هەتا چەند کارێکت بەدوای یەکدا ئەنجامدا، ئەگەر دوو بەرامبەری زیادکردنی بەرهەمەکەتی لێدەکەوێتەوە، سەرکەوتن سەرکەوتنی بەدواوەیە، هەر کارێکیش بەسەرکەوتوویی کۆتایی بێت هەستی متمانەو بڕوا بەخۆبوونت لا زیاد دەکات، هەر ئەنجامێکی سەرکەوتوو تواناکانی خۆت لائازیز دەکات بۆ ڕووبەڕووبونەوەی دوای ئەو، ئەنجامدانی هەر هەنگاوێك بە جیاو لەدوایدا چوونە سەر هی تر بەبێ دواکەوتن.

٥٤- چالاکییە سەرەکییەکانی ڕۆژانەت بگۆڕە بۆ خویەکی بە هێز، خوو پێوەگرتن شتێکە لە خۆتەوە پێی هەڵدەستی بە بێ (حوکم کردنی عەقلیواعی) هەریەك لە ئێمە ئەرکی ناخۆش و ڕق لێبوونەوەی هەیە لە گەڵ ئەوەشدا گرنگە، تەنها کە دەبێتە خویەك بە ساناتر قبوڵ دەکرێ، لەو کاتەشدا لەسەرت نییە کە بوەستی و بیری لێ بکەیتەوە.

٥٥- خووە کۆن و بێ سوودەکانت بگۆڕە بۆ خووی سوودبەخش، بڕیار بدە لەوەبەرهێنانی کاتت بە چالاکییەکی زیاتر، ئەمڕۆ دەست پێبکە، کەسانی تر تێبینی ئەنجامدانی زۆربەی کارەکانت دەکەن، زیاتر نرخی تۆیان لە لادەبێت سەرەڕای ئەوەی کە دەتوانی زۆرتر چێژ لە کاتە دەست بەتاڵەکان ببینی.

٥٦- بێنە بەرچاوت کە نیو ڕۆژت لەبەردەمە بۆ ئەنجامدانی کاری ڕۆژێکی تەواو، چی دەکەیت؟ بەچی دەست پێدەکەیت؟ کامەیان پێویستە لە سەرەتا بێت و لەدوایدا کامیان دێت؟ کاتێك کە دەزانیت بەکەمی کاتی بەردەست بۆ ئەم کارە سەرت سوردەمێنێ، لێرەدا ناچار دەبی کە پلانێکی بەرز دابنێیت بۆ بەرزترین ئاستی توانستی.




# کێشەو بڕیار

م. ڕێباز

**وەك بایەخدانێکی زیاتر بە واقیعی ئەمڕۆی بواری کارگێڕیو بازارسازی (بڕیار) لە دووتوێی گۆشەیەکی نوێدا «کێشەو بڕیار» هەڵدەستێت بە خستنە ڕووی کێشەیەکی وەهمی لەهەر ژمارەیەکداو هەوڵدەدات چارەسەری نموونەیی بۆ ئەو کێشەیە دیاری بکات، بۆ ئەوەی دواتر خاوەنی کێشەکە بڕیاری سەرکەوتووی خۆی بدات.**

**بۆ زیاتر ئاشنابوونی هەمووان و سوود وەرگرتن لە بۆچوون و ڕای جیاوازی یەکتری، بۆ گەیشتن بە بڕیارێکی سەرکەوتوو دەرگای «کێشەو بڕیار» کراوەیە بۆ هەر چارەسەرێك کە تۆی خوێنەر بە پەسەندو شیاوتری دەزانیت.**

ئەو دوو دڵە لە کاری ریکلام بۆ بەرهەمی تازەی کۆمپانیاکەی (کاروان)، پێی وایە ئەو ریکلامانەی کردویەتی وەك زیادە مەسرەفێکی بێ سوود بەسەر کارەکەیدا تێپەری کردووە، ئەو چەندین ساڵە لە بواری بازرگانی خواردنی قوتوو کار دەکات. لە دوا سەردانیدا بۆ وڵاتی مالیزیا لەگەڵ کۆمپانیایەکدا ڕێککەوتووە، بۆ بەرهەمهێنانی شەربەتی سروشتی بەناوی (خۆشاو) بە تامی جۆرەها میوە بەبێ هیچ زیادکراوێکی کیمیاوییو شەکر، ئەم پرۆژەیە زۆر جێی بایەخی (کاروان)ە، ئەو لە بیری ئەوەدایە دواجار خۆی کارگەیەك بۆ ئەو مەبەستە بنیات بنێ لە ناوخۆداو زیاتر سوود بگەیەنێو زیاتریش سوود وەرگرێ.

خاڵێك کە جێی گومانی (کاروان)ە تەنها ریکلامە، یەکەم پرسیار کە زیادەی گومانەکانییەتی: ئایا ریکلام پێویستە بۆ بەرهەمێك کە پێگەیەکی باشی لە بازاردا هەبێت؟ جگە لەوەش ئایا بودجەی ریکلام کە ژمارەیەکی کەم نییە بوودجەیەکی نییە کە بە هەدەر بڕواتو دواجار هیچ کەلێنێك پڕ ناکاتەوە، بەڵام ئەوەش بزانە کە ئەم بۆچوونە لە ئەنجامی ڕژدیو ڕەزیلی (کاروان)ەو، نەهاتووە، چونکە ئەو پێشتر ریکلامی بۆ هەندێکی لەو بەرهەمانە کردووە کە هاوردەی کردوون، بەڵام وەك ئەوە بووە کە پارەکەی فڕێ دابێت، بۆ نموونە لە ساڵی (٢٠٠٥) مەسرەفێکی زۆری کرد لە ریکلام بۆ ماست بە تامی میوە، ئەو کاتە لە وڵاتی تورکیاوە هاوردەی دەکرد، بەڵام دواجار نەك لە بەرهەمەکە بەڵکو لە کۆمپانیاکەش دوورکەوتەوە کە ماستەکەی دروست دەکرد.

ئەم پێشینە سلبیانەی وای لە کاروان کردووە نەوێرێ بچێتە ژێر باری ریکلام کردنەوە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا کاتێك دەبینێ ئەو هەموو بەرهەمانە ریکلامیان بۆ دەکرێ هەست دەکات کورتییەك لە بیرکردنەوەیدا هەیە، چونکە نابێت ئەو هەموو سەرمایە زۆرانە کە لە ریکلامدا بە کاردێت حسابی فەوتاوی بۆ بکرێت.

کەواتە کاروان هەڵەیە لە بۆچوونەکەیدا یان ئەو کۆمپانیایەی ریکلام دەکات دوای کڵاوی با بردوو کەوتووە؟

سەرەتا ئاشکرایە هەڵەیەك لە تێگەیشتنی (کاروان)دا هەیە بۆ کاری ریکلام، پاشان گەر جارەکانی تر لە ریکلامدا سەرکەوتوو نە بووبێت، نابێت وای دابنێت کە ریکلام بێ سوودە، لەوانەیە خەتای چۆنییەتی ریکلامەکە بێت.

ئەو بەو ڕوانینە گشتییە لە ریکلامکردن ورد نەبۆتەوە، چونکە هەرگیز ڕاست نییە کۆمپانیاکان بەبێ قازانج پارە لە ریکلام سەرف بکەن، ئەو لەدوا هەنگاوی پرۆسەی ریکلامکردنەوە دەیەوێت بگەڕێتەوە بۆ هەنگاوی سەرەتا، شارەزایانی ئەو بوارە بۆ ئەنجامدانی ریکلام شەش هەنگاوی سەرەکی کە ئاماژەی پێ دەکەن:

١- مەبەستی ریکلام: کە تیایدا تاکی کۆمەڵ لە حاڵەتی بێ ئاگاییەوە -لە بەرهەمەکە- دەباتە حاڵەتی جێبەجێکردن کە (کڕین)ە. بە واتایەکی مەیدانی مەبەست لە ریکلام گۆڕینی سیفەتی تاکە لە (بەکاربەر)ی گشتییەوە بۆ کڕیارێکی تایبەتی بەرهەمەکە.

٢- ئامانجی ریکلام: تیایدا ئەو توێژەی کۆمەڵ کە مەبەستە دیاری دەکرێت ئایا منداڵ، ئافرەت، گەنج، وەرزش دۆست،... هتد.

یان مەبەست لە هەموو کۆمەڵگەیە کاتێك بۆنەیەکی وەك جەژنەکان یان ڕووداوێکی گرنگ وەك هەڵبژاردن بەڕێوە بێت.

٣- بودجەی ریکلام: دیاریکردنی سەرمایەی پێویست بۆ بە ئەنجام گەیاندنی ریکلامەکە.

٤- دیزاینی پەیامی ریکلامەکە: ریکلام پێویستە هەڵگری پەیامێك بێت کە بتوانێت لە ماوەیەکی کەمدا باشترین زانیاریت بداتێ نەك زۆر ترین زانیاری، پەیامەکەش پێکهاتووە لە ئاماژەیەکی: وشە+ وێنە+ دەنگ+ ... کە بەگشتی هەموویان لە خزمەتی گەیاندنی زانیارییەکەدان. پێویستە بڵێم زۆربەی کۆمپانیاکانی وڵاتی ئێمە لەم خاڵەدا زۆر دواکەوتوون، لەوانەیە (کاروان)یش شکستەی لاوازی ئەو خاڵە بێت، بۆ نموونە بۆ ریکلامی ماست: خۆشترین ماستی تورکی، چلورە: باشترین بەستەنی ئێرانی، جلوبەرگ: جوانترین جلوبەرگی ئیتالی، عەتر: شازی عەتری فەرەنسی، مۆبیلیات: تۆکمە ترین تاقمی تورکی... .

یان بۆ پێدانی نازناوێك بە کاڵاکەی پەنا دەباتە بەر وەصفێکی شاعیرانە بۆ نموونە: ڕێستورانتی سوڵتان موزەفەر: پێگەیەك بۆ حەوانەوە، مۆبیلیاتی شالیار: تابلۆیەك لە جوانی، لە کاتێکدا ئەمانە هیچیان پەیامێك نین بتوانن سەرنجی بینەرو گوێگرو خوێنەر ڕابکێشن.

باشترین بنەما بۆ دیزاینو پێکهێنانی پەیامی ریکلام ئەو سێ خاڵەیە کە (ئێریك شۆڵتز) دیاریکردووە، شۆڵتز لە گەورە

بەڕێوەبەرەکانی بواری ساغکردنەوەی کاڵایە لە سێ کۆمپانیای (کۆکا کۆلا، واڵت دیزنی، برۆکتر گامبل)ی ئەمریکیدا کاری کردووە، ئێستا راوێژکارە لە واشنتۆنی پایتەختی ئەمریکا، ئەو سێ خاڵە بریتین لە:

أ- ئەو جەماوەرەی مەبەستە.

ب- سودەکانی کاڵاکە.

ج- هۆکارەکانی پێویستبوونی بەکارهێنانی بەرهەمەکە.

نموونەی دیزاینی پەیامێك لەسەر ئەو سێ بنەمایە بۆ بەرهەمێکی وەك (خۆشاو) کە ئاراستەی دایکان کرابێت، بۆ ئەوەی شەربەتێکی سروشتی بکرن بۆ منداڵەکانیان تاوەکو لەشێکی تەندروستیان هەبێت، بەم جۆرە دەبێت:

{دایکانی دڵسۆز بۆ منداڵەکانتان (بنەمای یەکەم)، خۆشاو باشترین شەربەتە کە سروشتیەو شەکرو هیچ مادەیەکی پارێزەری کیمیاوی تێدا نییە، (بنەمای دووەم)، کە زیان لە ددان و تەندروستی منداڵەکەت بدات (بنەمای سێیەم)}.

٥- هەڵبژاردنی کە ناڵی راگەیاندنەکە: ئایا بۆ ئەو جەماوەرەی کە دەتەوێت بیکەیتە کریاری خۆت، چ کەناڵێك لەبارە بۆ گەیاندنی پەیامەکەت، ئایا تی ڤی یە، رادیۆ، کورتەنامەی مۆبایل..... .

٦- هەڵسەنگاندن: لە دوا هەنگاودا کە هەڵسەنگاندنە تیایدا رێژەی کاریگەی ریکلام لەسەر فرۆشتنی کاڵاکە دیاری دەکرێ، هەر چەندە ئەمە کارێکی ئاسان نییە، چونکە فرۆشتن پەیوەستە بە کۆمەڵێك فاکتەرەوە کە یەکێکیان ریکلامە، بەلام دەتوانرێ بە پشت بەستن بە داتاکانی پێش دەستپێکردنی ریکلامەکە، ئەنجامی کارەکەو دەستکەوتەکانی دیاری بکرێت.

بۆیە دەتوانین بڵێین هۆکاری سەرنەکەوتنی ریکلام زیاتر لەو خاڵانەدا دەردەکەوێت، مەگەر لە حاڵەتێکدا کە بەگشتی سیستەمی ساغکردنەوەی کاڵاکە لە رووی نرخ و ئەو خەڵکانەی مەبەستن و ئەو شوێنەی کاڵاکەی تێدا خراوەتە روو، کەموکورتییان تێدا بێت، ئەو کاتە ریکلام کاریگەری ئیجابی نابێت.

دوا وتە بۆ (کاروان) ئەوەیە: ئەو پارەیەی کە لە ریکلامدا سەرف دەکرێت وەك جۆرێك لە وەبەرهێنان وایە، بەلام زیاتر مەعنەوییە وەك لەوەی مادیی بێت، بە تایبەت بۆ ئەو کە بەرهەمێکی تایبەت بە خۆی هەیەو چەند بتوانێت خزمەتی ناوی (خۆشاو) بکات، هێندە زیاتر سود مەند دەبێت لە داهاتوودا.




(بول ئورفیلا) باوك و دایکی بە رەگەز لوبنانین و لە ئەمریکا دەژیان، هەر لە منداڵییەوە تووشی نەخۆشییەك بوو، کە پێی دەوترێت (دیسلکسیا)، ئەم جۆرە نەخۆشییە وا لە نەخۆشەکە دەکات کە مێشکی توانای تێگەیشتنی لە پیتەکان نییەو ناتوانێت پیتەکان بکات بە وشە.

هەر لە پۆلی یەکەمەوە دوچاری ئەم نەخۆشییە بوو، زۆر نارەحەتی کرد، لەم قوتابخانە بۆ ئەو قوتابخانە دەیانگواستەوە، سەرەنجامیش هیچ فێر نەبوو، بەلام دایك و باوکی بە دڵسۆزییەوە زیاتر هانیان دەدا تا بەرەو پێشەوە بچێت.

(بول) لە بواری بازرگانیدا سەرکەوتنی بە دەستهێنا، لە سەرەتای دەستپێکردنیدا لە ساڵی (١٩٧٠) دوکانێکی بە کرێ گرت لە نزیك زانکۆیەك لە زانکۆکانی نیویۆرك، دوکانەکەی کۆپی و پێداویستییەکانی خوێندنی تێدا دانابوو)، پاش زیاتر لە (٣٠) ساڵ ئێستا خاوەنی زیاتر لە (١٧٠٠) مەڵبەندی بازرگانییە لە جیهانداو (٢٣) هەزار کارمەند کاری بۆ دەکەن و چالاکی بازرگانیشی بەردەوام زیاد دەکات، زیاتر لە (٢) ملیار دۆلار لە سەرمایەکەیدایەو کاری پێ دەکات.

ئێستاش پاش ئەو هەموو سامانە ناتوانێت بخوێنێتەوەو بنوسێت گوێ بۆ هاوسەرەکەی دەگرێت، کە شتی بۆ دەخوێنێتەوە! کەواتە ئەو کەسەی کە نەتوانێت لە بواری خوێندندا سەرکەوتوو بێت، چەندین بواری تر هەیە بۆ ئەوەی تواناکانی خۆی تێدا بخاتە کارو سەرکەوتن بە دەست بهێنێت!

سەرچاوە/ ئینتەرنێت

دەڵێن کات هەموو شتێك دەگۆڕێت، منیش دەڵێم: پێویستە لەسەرت خۆت دەست بە گۆڕان بکەیت،و چاوەڕوانی کات نەکەیت

(ئاندی وارول)

# Marketing Knowledge
# زانینی بازاڕسازی

م. هاژە شێروانی

دەبینین کە زانین بۆتە کلیلی سەرەکی پێش کەوتنی ئابووری وڵاتان و ڕێکخراوەکان جا چ بەرهەمهێنانی کاڵا بێت یا خزمەت، هەر وەك کە دیاردەی گەڕان بە دوای پسپۆڕی کارزان (کارگێڕی کارو هونەری کار) بە یەکێك لە جیاکەرەوەکانی ئابووری زانین دادەنرێت، وەك چۆن ئامارەکانی وڵاتە جیاوازەکانی جیهان ئاماژە دەکەن بە بوونی مەیلێکی گەورە بە ئاراستەی گەشەسەندنی ئەو کارانەی کە خاوەن مۆرکێکی زانینن، هەر ئەم کارانەش هێزێکی گەورە پێك دێنن بۆ ڕێکخراوەکان، فاکتەرێکی یارمەتیدەرە لە مانەوەو کێبڕکێ کردن لە بازاڕدا کە بە جوولە پێش کەوتوو و خێراییەکەی دەناسرێتەوە، بە تێبینی کردنی ئەوەی کە ڕێکخراوە سەرکەوتووەکان لە جیهانی پیشەسازی پێش کەوتوودا خاوەن گرنگیدانێکی گەورەن بە زانین، کە ئەو زانینە بە خاڵێکی کێبڕکێی گەورە دادەنرێت.

لێرەدا دەبێت ڕێکخراوەکان زۆر باش درك بەوە بکەن کە زانین سەرچاوەیەکی سەرەکی زیندوو و جێگیر و بەربڵاوە لە هەموو بەشەکانی ڕێکخراودا، کە دەتوانرێت بە کاربهێنرێت لە پێناو دۆزینەوەی خاڵی کێبەرکێ، هەر بۆیە دەبینین کە پارەیەکی زۆر خەرج دەکەن بۆ پرۆژەکانی زانین و کارگێری زانین، لە لایەکی ترەوە زۆرێك لە ڕێکخراوەکانی بازار زانین دەفرۆشن، هەروەك ڕێکخراوەکانی ڕاوێژکاری زانین و شارەزاییان دەفرۆشن، نەخۆشخانەکان خزمەتێکی چروپڕ لە زانین دەفرۆشن، بەڵام لێرەدا چی دەزانیت دەربارەی ڕێکخراوەکانی پیشەسازیی زانیارییەکان؟ بۆ وەڵامدانەوەی دەڵێین کە ئەم ڕێکخراوانە زانین دەفرۆشن لە ڕێگای بەرهەم و خزمەتە بەرهەم هاتووەکانیان.

دەبینین کە زانین لە گرنگترین داهاتەکانی هەر ڕێکخراوێکی کارە، کە کۆشش دەکات بۆ بەردەوام بوون و سەرکەوتنی لە بازار، دەرچوونی زانین هەر بۆ خۆی فاکتەرێکی دیارو بەرچاوە بۆ بەردەوام بوون و سەرکەوتن، دەبینین کە زانین هاوشانی هەموو قۆناغەکانی کارە، هەر زانینە کە پاڵپشت و یارمەتیدەرە بۆ تەواوکردنی ئەو قۆناغانەی کار لە هەر ڕێکخراوێك.

بە بێ گومان دەبینین کە بەر بڵاوی زانین لەم سەردەمەی کە تیایدا دەژین گۆڕانکاری قوڵ و گەورەی کردووە لە هەموو لایەنەکانی ژیانماندا، تێڕوانینمان بۆ زانین و مامەڵەکردن لەگەڵیدا بەو ئاستە نەبووە کە لە سەدەکانی رابردوودا تێپەڕیوە، هەر بەو جۆرەش نەمایەوە کە زانین تەنها سەرمایەیەکی کەم بێت و دەست خستنی ئاستەم بێت، بەڵکو شۆڕشی گەیاندن و زانیاری و ئامێرەکانی بە تایبەتی ئینتەرنێت، بۆ زانین بوو بە داهاتێکی بەردەست و سانا، تاوەکو ڕووبەڕووبوونەوەی گەڕان بەدوای زانین بە چەندێتی بۆ چۆنییەتی مامەڵەکردن لە گەڵ ئەو قەبارە گەورەیەی زانین و پۆلێن کردنی زانینی بە سوودو دانانی لەو لایەنەی کە بتوانین مامەڵەی بنیاتنەرانەی لەگەڵ بکەین بە مەبەستی سوود وەرگرتن لێی.

لێرەدا زانین لە سەردەمی زانیاری (عصر المعلومات)دا بوو بە کۆڵەکەی چوارەمی پرۆسەی بەرهەمداری و لە گرنگیدا هەموو کۆڵەکەکانی تری تێپەڕاند و بوو بە هۆی گرنگی دان بە کارگێری، لەبەرئەوە کارگێری زانین (اداره المعرفه) سەری هەڵدا، کە هەندێك لە ڕێکخراوەکان پەنایان بردە بەر کەمکردنەوەی قەبارەکەیان بە مەبەستی ڕووبەڕووبوونەوەی کێبەرکێ، کە بتوانرێت تێچوونیان کەم بکرێتەوە، تا ڕێکخراو پارێزگاری نەکات لەو زانینەی کە کرێکارەکانی هەیانە، دەبینین بچووکی قەبارەکەی دەبێتە هۆی زیان گەیاندن بە بەشێکی گەورە لە زانیاری، لە پاڵیدا بەرزبوونەوەی تێکرایی سووری کارکردنی لە بازاری چالاك و رۆژانە دەبێتە هۆی ئەگەری لە دەست دانی گەیشتن بە قەبارەیەکی گەورە لە زانینی زیندوو، هەروەها بە هۆی فراوانبوونی ڕێکخراوەکان و بەربڵاویان لە سەر ئاستی جیهان وایکردووە کە بەربەستی جوگرافی نەمێنێت و کاریگەری لە سەر ئاڵوگۆڕی زانین و گەیشتن بە زانیاری و دەست خستنی ئاسان بێت، ئەمانە و چەندان هۆکاری تر پاڵ بە ڕێکخراوەکان دەنێت بۆ گەڕان بە دوای ڕێگای باشتر بۆ کارگێری زانین.

لێرەدا دەتوانین تێبینی ئەوە بکەین کە زانین بریتییە لە درك پێکردنی روون بۆ شتەکان و راستییەکان و هەڵسوکەوت و تێکەڵەیەکە لە شارەزایی و کارزانی و بەهاو زانیاری لە بوارێکی دیاریکراوی کار، توانای تاك لە سەر ناسینی شتەکان و جیاکردنەوەیان، ئەمەش دەرخستەی داتاو زانیاری پارێزراوە لە عەقڵی تاك لەگەڵ روانینێکی باش بۆ شتەکان (روانینێکی ورد) و حوکم کردن لە سەری و بوونی هێزی جیهانگەرایی ڕێکخراوەکان هاندەرێك بوو بۆ پەرەپێدانی پسپۆڕییە نوێیەکان کەوا لە ڕێکخراوەکان دەکات کە لە هەوڵی بە دەست هێنانی داهاتی نائاساییدابن لە بازارەکانی جیهاندا، ئەم پسپۆڕیانەش گرنگی بە بنیاتنانی جیاکەرەوەی بازاری جیهانی بدەن، لەم پسپۆڕیانەش زانینی هەمیشە کریار (معرفه الزبون) و زانینی بەرهەمهێنەر (معرفه المنتج) و زانینی دابینکەر (معرفه المجهز) و هەروەها زانینی رکابەر (معرفە المنافس)، لەگەڵ تێبینی بوونی ئاراستەی تری کارکردن و زیادکردنی ئارەزووی دەست خستنی زانینی بازار هەروەك بوونی تێچوونی پەرەپێدانی بەرزو کورتکردنەوەی سووری ژیانی بەرهەم هاندەرێك بوو بۆ زۆرێك لە بەرێوەبەران کە بگەرێن بەدوای چوونە نێو بازاری نوێ بە خێرایی بە مەبەستی هەماهەنگی ستراتیژی لە نێو رکابەرەکان و زیادکردنی هێزی بازار، زانینی بازاریش تایبەتە بە چالاکی و پێشکەشکردنی تایبەت بە رکابەرەکان، لەگەڵ ئەو مەرجەی کە دادەنرێ و سەرەرای ئەوەی کە ئەو زانیارییە دەبێتە ئاراستەیەکی فرۆشتنی گشتی لە بازاردا.

لێرەوە دەتوانین پێناسەی زانینی بازارسازی یا بەبازارخستن بکەین بەوەی کە بریتییە لە دیاردەیەك کە ڕێکخراوەکانی کار کۆشش دەکەن بۆ گەیشتن پێی لە ڕێگای دیراسەت کردن و شیکردنەوەی بازار بە ئامانجی دیاریکردنی پێداویستی و ئارەزووی کریارو سروشتی رکابەری هەبوو بە جۆرێك کە توانای

درك كـــردن بە بازارو فاكتـــەری حوكم كردوو پێـــی جیاكەرەوەیەكی ركابەری بـــۆ رێكخراو دەستەبەر دەكات لە سەر ئاستی بازار.

لە ســـەر ئەو بنەمایـــە دەتوانین بڵێین كە زانینی بازارســـازی بریتییە لـــە داتاو زانیاری كۆكراوە لەســـەر بازار لە لایەن رێكخراو، ئەو زانینە ئایدیایەكی گشـــتیو تایبەتە لە ســـەر رێكخراوو ئەو بـــازارەی كە كاری تیادا دەكات، بە گوێرەی ئـــەو هێزەی كە كاری تێدەكات كە ئەویش بریتییە لە (كریارو لایەنی دابین كەر) هەروەها بەرهەمە پێشكەشكراوەكان لە بازار، سروشـــتی ئەو ركابەرییە چییە كە هەیە؟ هی تر لە هێزی كاریگەر لە سەر بازاری رێكخراو.

گرنگـــی دان بە زانینی بازارســـازی زۆرتر دەبێـــت تـــا رێكخراوەكە كۆنتر بێت لـــە بازار، ئەمەش لە رێگای ســـوری ژیانی رێكخراوەكەیە لە بازارو قۆناغەكانی یەكەمی ئەو ســـورەی لە بازار مەیلی بەرێوەبەران بەرەو تیشك خستنە ســـەر نوێ بوونـــەوەو پێشـــكەوتنی تەكنیكە، بەڵام تا رێكخراو كۆنتر بێت لەم ســـورە گرنگی بەرێوەبەران بە زانینی بازارسازی زیاتر دەبێت وەكو شێوازێك بۆ پاراستنی پێگەی ركابەریان.

بـــە تێبینـــی كردنـــی زانینی بازارســـازی وەكـــو كلیلێكی ركابـــەری كـــردن، هەرچەند پێداویستیە سەرەكیەكانی رێكخراو پر بكاتەوە لە زانیاریو كارزانی جیاواز، نابێت پێشـــبینی گەیشـــتنی یەكێكیان بكەین بۆ دەستخســـتنی گشت داهات یا سەرچاوەكانی كە پێویستییەتی تاوەكـــو كارەكـــەی ببوژێتەوە بەبـــێ بەهەند وەرگرتنی ئەو زانیارییەی كە لەسەر بازار كۆی كردۆتەوە، لە ســـەر هەریەك لە ركابەرەكانو كریـــارو دابینكەرانی ئەو بـــازارەو بەرهەمی پێشكەشـــكراوو هەروەها تەكنیكی بەكارهاتوو مـــاوەو فراوانی ئەو بـــازارە، ئەمانە هەمووی كاردانەوەی گرنگی هەڵســـانی رێكخراویان لە سەر دەبێت لە بنیات نانی بنكەیەكی زانیاری تایبەت بەو بازارەی كە مامەڵەی لەگەڵ دەكەن تاكو بتوانێت لە ئاراستەی دژەكانی كە بازار بە سەر رێكخراوی دەچەسپێنێ دەربازی بێت.

تاوەكـــو چەمكـــی زانینی بازارســـازی لە لای رێكخراو روونتر بێت لە سەر رێكخراو پێویستە كە ئەو زانینی بازارسازییەی بنیات بنێ لە رێگای:

١- تاقیكردنەوەی بـــازار: تاوەكو رێكخراو سەركەوتوو بێت لەو لێكۆڵینەوانەی كە لە بازار دەیان كات لە رێگـــای (پێوانەكردنی قەبارەی داواكاری، هێـــزی ركابـــەری، ژمـــارەی كریار، جۆری بەرهەمی پێشكەشكراو، ئاستی تەكنیكی بەكارهاتوو، قەبارەی گەنجینەكراوی).

٢- پێكهاتـــن لەگەڵ نێوەند: مەبەســـت لە نێوەنـــد پێشكەشـــكاری زانیـــاری، مەرجیش نییە كە ئەو كەسە دیاریكراو بێت بەڵكو هەر كەسێكی سروشتی یا مەعنەوی بێتو بتوانێت رێكخراو لە رێگایەوە زانیاری تەواوی لە ســـەر بازار دەســـت بخـــات بە مەبەســـتی بنیاتنانی وێنەیەكی تەواو لە سەر ئەو بازارە.

٣- زانینی بازار لە دەرەنجامی شارەزایی: لە دەرەنجامی زانیاری كۆكراوە لە ســـەر بازار، تا زانینی بازارسازی باشتر بێت رێكخراو دەتوانێت بڕیارەكانـــی بـــە باشـــترین شـــێوە دەربكاتو بەراووردەكانی گەڕاوەی لەســـەر بازار دەســـت بخـــات، زۆربوونی زانینی بازارســـازی دەبێتە هۆی زۆربوونـــی متمانە لەلایـــەن بڕیاردەری ستراتیژی رێكخراو.

# ڕێگاکانی بیرکردنەوە

**پشتیوان موبارەك كەریم**

مرۆڤ هەر لە سەرەتای دروست بوونیەوە، لە ئەنجامی گەران‌و هەڵسوکەوت‌و ئەزمونکردنی ڕووداو دیاردەکانی دەوروبەرو ژیانی ڕۆژانەیەوە یان لە ئەنجامی مومارەسەی ژیانی ڕۆژانەیەوە ڕووبەرووی کێشەو تەنگ‌و چەڵەمە دەبوویەوە، سەرەنجام بۆ چارەسەرکردنی کۆسپ‌و تەگەرەکانی ژیانی ڕۆژانەی پەنای دەبردە بەر بیرکردنەوە، هەتا وردە وردە پرۆسەی بیرکرنەوەی بوو بەشێك لە ژیانی ڕۆژانەی‌و بە ناچاری کاتی تەواوی لێ دەگرتن، هەتا بەرە بەرە چەندین هۆکار یان داهێنان بۆ ئاسان گوزەراندنی ژیانیان وەك دۆزینەوەی ئاگرو پەناگەو پاشان ژیانی بە کۆمەڵ.... هتد. بۆ نموونە لە ئەنجامی بیرکردنەوەوە ئەو ئەنجامەی کە بۆ بەدەستهێنانی ئاو پێویست ناکات هەموو ڕۆژێك ماوەیەکی دوورودرێژ ببڕن، بەڵکو هەر لە نزیك سەرچاوەکانی ئاودا نیشتەجێ دەبوون، پاشان یەکتریان دەناسی‌و فێری پێکەوە ژیان بوون، سەرئەنجام گوندو شارو شارۆچکەکان‌و پاشانیش شارستانییە جۆربەجۆرەکان دروست بوون، کە لە ئەنجامی پێویستییە جیاوازەکانەوە چەندین داهێنان لە بوارە جۆربەجۆرەکاندا کرا. لێرەوە بە هۆی تێکەڵاوی‌و هاتووچۆی نێوان ئەو شارستانیەتەوە چەندین ڕێگای بیرکردنەوە، زۆر جاریش جیاواز لە یەکتر دروست بوون کە سەرەکیترینیان دوو ڕێگا بوو کە تا ڕۆژی ئەمڕۆمان بەردەوام کاریگەری بەرچاوی هەیە لەسەر تاکەکانی کۆمەڵگە کە ئەوانیش بریتی بوون لە:

أ- بیرکرنەوە بە دڵ:

ب- بیرکردنەوە بە مێشك:

ئەوەی شایانی باسە پوختەی دەرەنجامەکانی هەردوو ڕێگاکە چەندین واقیعی (پۆزەتیف‌و نێگەتیف)ی یاخود خوازراو نەخوازراوی هێنایە گۆڕێ بەهۆی ئەوەی هەر کام لەم دوو ڕێگەیە هۆکار کاری تێدەکردن تاکو بیرکرنەوەکە دەگەیشتە ئەنجام‌و بڕیاردان، بۆ نموونە ڕێگای بیرکردنەوە بە دڵ هەندێك هۆکاری وەك ڕق‌و کینە یان سۆزو بەزەیی یاخود پاوانخوازی‌و تۆڵە سەندنەوە یان حەزو ئارەزووی کاری تێدەکات، کە هەریەکەیان بڕیاری پێچەوانەی لێ دەکەوێتەوە، بۆ نموونە بڕیارێك لە ڕق‌و کینەوە درا بێت جیاوازە لەو بڕیارەی کە لە سۆزو بە زەییەوە درابێت.

یاخود بیرکرنەوە لە ڕێگای دڵەوە بێت چەندین هۆکاری وەك فریودان کارا دەبێت لەسەر بیرکردنەوەی کەسەکە تاکو بڕیارێکی نەخوازراو دەربکات، یان هاندان مرۆڤ ئاراستە دەکات بەرەو چەند بڕیارێکی وەك تۆڵەو چەند کردارێکی نەخوازراوی تر، کە ئەنجامی چەندین شەڕی خوێناوی‌و ماڵ وێرانکەری مرۆڤایەتین کە مێژوو هەرگیز لە یادیان ناکات.

بەڵام ڕێگای بیرکردنەوە بە مێشك یاخود بە مانایەکی تر بە عەقڵ زیاتر لۆژیك بەسەریدا زاڵە، بڕیاردان پاش تاوتوێکردن‌و شیکردنەوەو لێکدانەوەی وردو درشتی بابەتەکە، لەسەر خۆو پەلە نەکردن لە بڕیارداناو بیرکردنەوە لە ئەنجامەکانی، پاشان بڕیار دەدات، بیرکردنەوە بەم ڕێگایەیان کەمترین هەڵەی تێدەکەوێت، چونکە ئەزموون‌و ئاستی هۆشیاری ڕۆڵێکی کاریگەریان هەیە لە بڕیارداندا بە تایبەت کە بە فلتەری لۆژیکدا تێدەپەڕێت، بەرهەمی ئەم ڕێگایەی بیرکرنەوە چەندین دەستکەوتی بۆ مرۆڤایەتی بەرجەستە کرد لە نموونەی ئاشتی‌و پێکەوە ژیان‌و یەکتر قبوڵ کردن‌و بەرهەمهێنانی چەندین چەمك‌و هۆکاری تر لە پێناوی خۆشگوزەرانی‌و ئاسوودەیی بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی، لەوەش گرنگتر چاوەڕوانی ئەنجامی باشتریش لە لۆژیك دەکرێت.

# ڕێگا بەرەو ناخ

طالب نوری / ژاراوە

چۆن لە خودی خۆتدا گۆڕان بەرپا دەکەیت؟

مرۆڤەکان بەگشتی خاوەن کۆمەڵێك ڕەفتارو ئاکاری خراپو دزێوی وەهان، کە زۆرجار ئەستەمە وازیان لێبهێنێت، هەرچەندە ڕقیشی بێتەوە لێیان، زۆرێك لەوان نایانەوێت خۆیان پاکبکەنەوە لەو ڕەفتارە بەدو دزێوانە، بە بەهانەی ئەوەی: ناتوانم، کارەکە گەورەیە، ترسناکە، ناکرێت، ژیانم لێ تێکدەدات، تووشی نابەجێیتردێم، سەرکەوتوونابم.... هتد.

بەڵام بابزانین هیچ دکتۆرێك باشترنیە لەئێمە بۆخۆمان، باشترین دکتۆری من تەنها خۆمم، باشترین دکتۆری تۆ تەنها خۆتی... لە کاتێکیشدا تۆ لە هەموو خەڵکی زیاتر شارەزای بەکەمووکورییەکانی خۆت، کەواتە: دەبێ خۆت هەستی بەگۆڕان لەخودی خۆتدا، ئەگەرنا وادیارە چاوەڕێی فریشتەیەك دەکەی کەلەئاسمانەوە دابەزێتو دەستت بگرێتو نەهێڵێت کاری نابەجێ ئەنجام بدەیت!؟

یاخود بە قامچییەکەوە پێش خۆیت بدات بەرەو کاری جوانو ڕەفتاری باش؟! ئەمە خۆفریودانێکی سەیرە!!

بەڵکوخودای گەورە کەتۆی دروستکردووە، توانای ئەوەی پێداویت تاکو بەرەنگاری کارە دزێوو قێزەونەکان ببیتەوە، بەهەستو نەستو ژیریت، نەك پاڵدانەوەو پشتگوێخستن، بیرکردنەوەو خۆپەکخستن.. ئێستاش با چاوەکانمان بکەینەوە بۆ خوێندنەوەی چەند بنەمایەك تا بیرکردنەوەمان قوڵ بکاتەوە لەناخماندا، هانمان بدات بەرەو ڕەوشتو ڕەفتاری شکۆدار، لەناو درکەوە بۆ ناو گوڵزار، لەوەرزی خەزانەوە بۆ وەرزی بەهار...

* بۆچی دەبێ خۆم دروست نەکەم لەکاتێکدا دەوروبەرو کۆمەڵگاکەم پێویستیان پێمە، چاوەڕوانی منن، تاکو ببمە:

ڕەشماڵی سێبەریان، هەوری بارانیان، گوڵزاری بەهاریان...

* بۆچی خۆم بەکەم دەزانم لەکاتێکدا خودا بوونی پێداوم، لەم بوونەدا هەموو جوانییەکان دێنە بوون، بۆدەوروبەرو بۆ بوونەوەر...

* چەندان دەست لە ڕووماندا کراونەوە بۆ ئەوەی پێیان ببەخشین، بەڵام بزانە! بۆ پێبەخشینیان دەبێ بجووڵێین بۆ پەیداکردن.

* دەوروبەر چاوەڕێی منن، دڵخۆشیان کەم، بیان هێنمە پێکەنین، بۆ ئەم کارە دەبێ زەردەخەنە دروست بکەم، ڕووگەش ببمو قسەی شیرین بکەم.

* فێرببە بۆ ئەوەی فێربکەی، بزانە بۆ ئەوەی زانیاری بدەی، وەك دارێکی بە بەرهەم بە، کە هەموو مرۆڤێك لێی سوودمەند دەبێ، بۆچی ڕازی دەبی بەوەی داری زرو بێ بەرهەم بی؟! دەبێ بزانین کە تاکو ڕەفتارە نا دروستەکان لەخۆمان دوورنەخەینەوە، خۆمان لە کارە ناشیرینەکان پاك نەکەینەوە، ناتوانین ئاسودەبین لەژیاندا، وێنەی ئەمە وەکو ئاوی ڕوون وایە لێڵ بکرێت، خواردنی پاك پیس بکرێت، وێنەی جوان ناشیرین بکرێت......

* با چاوەڕوانی دەوروبەرو هاوڕێیان نەبین بمان گۆڕن، چونکە لەوانەیە بتوانن، لەوانەشە نەتوانن، بەڵام خۆمان دەتوانین خۆمان بگۆڕین، پاشان دەبێ ئێمە هەوڵی گۆڕانکاری بدەین بەپاکسازیو چاکسازی...

* کاتێك کەهەست دەکەم بەپێویستی خۆگۆڕین بەرەو بڵندی، بەرەو بەرزی، پێویست دەکات خۆم دوانەخەم، لە کاروان خۆم وەلانەخەم، چی تر نەڵێم: ئەوان! ئەوان! کاتی ئەوە هاتووە بڵێم: خۆم، خۆم...

* دەبێ خۆمان بە باشترو چاکترو گەورەتر بزانین لەوەی کەخۆمانو ژیانمان بەکار بهێنین لەکاری نابەجێو ناهەموارو ڕەفتاری دژوارو لارو خوار...

* کاتێك کە خەڵکی دەبینین لە خراپەو ئاکارو ڕەوشتی نابەجێ دایە، دەبێ بەزەییمان بێتەوە پێیاندا، هەروەها دەبێ یارمەتیان بدەین تا ڕزگاریان بێت لەم ئازارو مەینەتە لەم بەد بەختییە، بەڵام بزانە ناتوانین ئەمە بکەین، تا لە ناخمانەوە نەگۆڕێین، خودی خۆمان چاكو پاك نەکەین، چۆن کۆیلەیەك دەتوانێت کۆیلەیەکی تر ڕزگاربکات؟!

* دەبێ خۆمان ڕەخنەگرێکی لێهاتووو کارامەبین بۆ خودی خۆمان، بۆ ئەو مەبەستە سەر کۆنەی خۆمان بکەین!

بۆ داماڵینی ڕەفتارە نابەجێو نا لە بارەکان، بەوەش پاڵنەری گۆڕان دروست دەکەین لە ناخماندا.

* ئەوەی کەگوترا لەبنەماکان، ئەوە ناگەیەنێت کە مرۆڤ دابڕێت لە مرۆڤەکانی ترو سودمەند نەبێت لە ئەزموونی ئەوانی تر، نەخێر نا، چونکە مرۆڤەکان هەر وەکو چۆن دەتوانن یەکتری بروخێنن، ئاواش دەتوانن یەکتری دروست بکەن..

* دەبێ بزانین کە گۆڕانکاری لەخودا کارێکە مرۆڤ ماندو دەکات، مرۆڤ توشی ململانێ دەکات لەگەڵ ئارەزووەکانیدا، لەگەڵ ڕەفتارەکانیدا، بە واتایەکی تر: لە خودی خۆیدا، بەڵام گرنگ لێرەدا نەبەزینە لەو بەربەرەکانیو شەڕەدا، تا دەیسەلمێنێت کە مرۆڤێکی شایەنە، بە شکۆمەندی لە دونیاداو سەرفرازی لە دواڕۆژدا...



پشتیوان حمە خان

# ژیان و نوێبوونەوە! یان دووبارە کردنەوەیەکی بێمانا!

ژیـان ئەو ململانـێ بەهێزەیە لـە نێوان مرۆڤ‌و گوزەرانیان لە رووی لە دایك بوونەوە تا دوا هەناسە هەمیشە لە ململانێدان.

سەنگەری رووی بەرزبوونەوەی ژیان رۆژ لە دوای رۆژ دژوارتر بە چەشنێك ژیانێکی نوێخوازو مۆدێرن پڕ بەمانای نوێ بوونەوە بێت.

لە راسـتیدا هاتنی شەوو رۆژو وەرزەکانی سـاڵ دووبارە بونەوەیەکی بەردەوامی ژیانەو هەمیشـە هاوسـەنگی‌و باڵانسـی ژیانیـان راگرتووە.

سـەرەتای ژیان بە شـێوازێکی زۆر سـانا دەسـتی پێکـردووەو لەگـەڵ تێپـەڕ بوونی رۆژگـارو هاتنەدی سـەردەمی شارسـتانیەت هێـدی هێـدی دژواریەکانـی ژیـان پەرەیان سەندووە. لەگەڵ ئەوەشـدا هۆکارەکانی ژیان ئاسان بووە.

ژیـان رۆژ بە رۆژ لە پێـش کەوتن‌و نوێ بوونـەوەدا نەبێت ئەوا رووخـان‌و دارمانێکی لەسەر خۆیەو پێوستە هەموو تاکێکی کۆمەڵگە چاودێـری‌و بـە دواداچوونـی رۆژگارەکانـی تەمەنـی بکات کـە ئایا دووبـارە کردنەوەیە یان گۆڕانکاری بەردەوامە بە ئاراسـتەی باشتر کردنی باشـەکان‌و جوانترکردنـی جوانەکان‌و لەناو بردنی گەندەڵیەکان‌و خراپەکان.

کەواتە پێویسـتە ئەمرۆ باشـترو چالاکتر بین لە دوێنێ‌و بەیانی باشـترو چالاکتر بین‌و پرۆژەو کارەکانمان زیاترو باشتر بن لە ئەمرۆو بەردەوام بوون تاکو ژیانت بەردەوام دەبێت.

کات کە بەشـێکی گرنگی ژیانەو هەمیشە لە کەم بوونەوەدایەو سـات لە دوای سات وەکو بەفـری چیای بەهاران دەتوێتـەوە بێ وچان، بۆیە زۆر پێویستە ئەو کاتە بەنرخە هەمیشە بەو نرخەو بەهایەی خۆیەوە تەماشا بکرێت‌و لـە ژیانێکـی پڕ لەنـوێ بوونـەوەو داهێنان بەکاربهێنرێت.

تەمـەن‌و ژیان بۆ تەنها سـاتێکی کەمیش لە ڕێرەوی ئاسایی خۆی ناوەستێ‌و چاوەڕوانی مـەردووم ناکات! بۆیە پێویسـتە مەردومیش بەم راستیە بزانێت‌و بۆ تەنها ساتێکی کەمیش لێ نەگەڕێ بە فیڕۆ بچێت.

دووبـارە بوونـەوە بـێ مانـاکان‌و بەفیڕۆچوونـی کاتە بەنرخـەکان‌و نەبوونی چاودێـری بەردەوامی رۆژانـەی تەمەن، ئەوا ژیانێکی مردووە لە فەرهەنگی ئەو تاکەدا.

ژیان پڕ بە مانا بریتییە لە نوێبوونەوەو پێشکەوتنی بەردەوام.




بـە داخـەوە لـە هەندێـك کۆمەڵگـای پێش کەوتـوودا هەندێك دیـاردەی سـەیر دەبینیت کە گـوزارش لە بۆچوونـی هەڵە دەکات سـەبارەت بە مەسـایلێك کـە نەدەبـوا کۆمەڵگای پێشـکەوتوو وەهـا بیربکاتەوە، یەکێك لـەو دیاردانەش دیاردەی خورافـات‌و بیروبـاوەری پڕوپوچـە سـەبارەت بە هەندێ شت کە ژمارە (١٣) یەکێکیانە!

لە رۆژئاوادا بە تایبەت، رەشـبینییەکی سـەیر هەیـە بەرامبەر ژمارە (١٣) تـا رادەی ترس‌و لەرزو هەڵسوکەوتی سەیروسەمەرە.

لە ئەمریکادا زۆر دەگمەنە ئەگەر باڵەخانەیەك نهۆمـی (١٣)ی تێدا بێت، یـا میوانخانەیەك ژووری (١٣)ی تێدا بێت.

ئـەم ژمارەیە لە رۆژئـاوای پێشـکەوتوودا بە ژمارەیەکی شووم ناوزەند دەکرێت.

خەڵکی بەهیچ شـێوەیەك حەز لـەم ژمارەیە ناکەن‌و حەز ناکەن ئەم ژمارەیە لەهیچ چالاکیەکی رۆژانەیانـدا بەکاربهێنـن، کێشـەکەش گەورەتـر دەبێتـەوە کاتێـك بـەرواری (١٣)ی هـەر مانگێك بکەوێتە رۆژی هەینیەوە!

(دونالد دوس) کە پزیشکێکی ئەمریکییە دەڵێت: « ئـەو دیاردانەی کە تووشـی (٢١)ملیۆن ئەمریکی دەبێت لەم رۆژەدا بریتیە لە دڵەراوکێ‌و نیگەرانی‌و هەسـت کردن بە رەشبینی‌و تۆقین، بەشێوەیەك کە هەندێـك لەو کەسـانە ئەو رۆژانە جێگای نوسـتن بەجێ ناهێڵن‌و لەماڵەوە ناچنە دەرێ».

لە لێکۆڵینەوەیەکدا کە گۆڤاری «سمیشـونیان» ئەنجامـی داوە دەرکەوتـووە کـە کۆمپانیـا ئەمریکییـەکان هەموو هەینی (١٣)ی مانگێك (٧٥٠) ملیۆن دۆلار زەرەر دەکەن، چونکە خەڵکی لەم رۆژەدا

ع. ش. شێرکۆ

شەیەکی

ێتەوە!!

13

نە بازار دەکەن‌و نەدەچنە سەفەرو نە هیچ کارێکی وەها ئەنجام دەدەن، ئەم ترسەش تەنها لەمێژووی نوێی ئەمریکادا نیەو ڕەگی مێژوویی کۆنی هەیە.

لە ڕۆمانی کۆندا جادوگەرەکان بە شێوەی کۆمەڵێکی (١٢) کەسی کۆ دەبوونەوەو ژمارە (١٣) یان بۆ شەیتان بەجێ دەهێشت، ئەسکەندە نافیە کۆنەکانیش (١٣) گرێیان لە پەتی سێدارە دەدا،

هەندێکیش دەڵێن: حەوا لە هەینی (١٣) ی مانگدا سێوەکەی دا بە ئادەم‌و لە(١٣) ی مانگیشدا قابیل هابیلی کوشت!

ئەم بیروباوەرە پڕو پوچە گوازراوەتەوە بۆ زۆر وڵات‌و زۆرێك لە خەڵکیش ئەو بڕوایەیان هەیە سەبارەت بە ژمارە (١٣) بێ زانینی هیچ هۆکارێك!

بەڕاستی ئەو جۆرە عەقڵیەتانە زۆر سەیرن کە بڕوا بەشتی وا دەکەن‌و لەژمارەیەکی بێ ڕۆح‌و بێ گیان دەترسن!.

دەبوا ڕۆشنبیران‌و خوێندەواران دژ بەم بیروباوەڕەو هەموو خورافات‌و پڕوپاگەندەیەکی هەڵبەستراو بوەستانایەتەوە نەك باوەڕی پێبهێنن!!

پێویستە لەسەر هەریەکێك لە ئێمە کە متمانەمان بە خۆمان هەبێت‌و وەك کەسانی لاوازو بێ متمانە خۆمان تەسلیمی خورافات نەکەین‌و باوەڕمان بە شتی وەها نەبێت.

ژمارە (١٣)ی بریاریش بە نایابترین شێوە کەوتە بەردەستان‌و سەلماندی کە هیچ کێشەیەکی لەگەڵ ژمارە (١٣) دا نییە!!

ئەوەی جێگای سەر سوڕمانە ئەو وڵاتانەیە کە دوای ئەوەی گەیشتونەتە ئەو ئاستە لە پێشکەوتن‌و تەکنەلۆژیادا بەڵام لە ژمارە (١٣) تۆقیون!؟!

# چۆن کەسایەتییەکی سەرنج ڕاکێش بەدەست دەهێنیت؟

ئاوات تەها

هەندێکجار کەسانێك دەبینین لە ژیانماندا سۆزو خۆشەویستیمان بە لای خۆیاندا ڕادەکێشن، کە سایەتییەکی سەرنج ڕاکێشیان هەیە، کاریگەری دەبێت بەسەر هەر یەکێك کە لە گەڵیاندا تێکەڵ دەبن، هەر یەکێکیان حەز دەکات کە سایەتییەکی وەکو ئەمانەی هەبێت، بێگومان چەند بنەمایەکی سەرەکی هەیە بۆ ئەو کەسایەتییانە، وەکو ئەم نموونانەی خوارەوە:

یەکەم: ڕووخساری دەرەوە: لەبەر ئەوەی شکلت پێش هەموو شت چاو بە لای خۆیدا ڕادەکێشێ، گەیشتن بە دڵەکان دەبێت کاری سەرەکیمان بێت. بۆیە دەبێ گرنگی خۆی پێ بدرێت، ئەوەش گرنگیدان بە پاك‌وخاوێنی‌و بە کارهێنانی بۆنی خۆش‌و ئارام بەخشە.

دووەم: ئەدەبی هاودەمی: کاتێك لەگەڵ یەکێك دادەنیشی بە گوێرەی توانا هەوڵ بدە گرنگی تەواوی پێ بدەیت، سەرقاڵ مەبە بەسەیرکردنی زەوییەوە، یان بە مۆبایلەکەتەوە، زۆر لێی نزیك مەبەرەوە وەکو لەزگە، جوڵەو ئاوردانەوەت کەم بکەوە، ئاگاداری جوڵەکانت بە، نەوەك بەبێ ئاگا هەڵە بکەیت، هەوڵ بدە بیرکردنەوەت لە قسەکانی ئەو بێت، لەوانەیە پرسیارێکت لێ بکات تۆ نەتوانیت وەڵامی بدەیتەوە، لەو کاتەدا ئەو واتێدەگات کە تۆ لە قسەکانی بێزاری‌و حەزت لێی نییە.

سێیەم: هەوڵ بدە زیاتر گوێگر بیت نەك قسە بکەی، بیر لە قسەکانت بکەرەوە پێش ئەوەی بیان دەرکێنیت، وشەکانت بە ڕێکی دەربڕە، قسە لەسەر شتێك مەکە کە متمانەت پێی نییە یان زانیاریت لە بارەیەوە نییە، دەنگت بەرز مەکەرەوە، بەشێوەیەکی هێمن‌و لەسەرخۆ قسە بکە، قسەی پێ مەبڕە هەتا ئەگەر ڕوونکردنەوەو یان ڕەخنەت هەبوو، مادام داوای ڕوونکردنەوە یان پرسیاری لێ نەکردیت، ڕەخنەی زۆر مەگرە ئەگەر لەسەر حەقیش بوویت، ئەگەر ڕەخنەشت گرت با بەشێوەیەکی جوان‌و ڕێکوپێك بێت، هەوڵ بدە قسە لەو بوارەدا بکە کە قسەت لەگەڵدا دەکات.

چوارەم: مافەکانی برادەرایەتی: ئێستا دەگەیتە قۆناغی دووەم لە هەڵسوکەوتی جوان پاش بڕینی قۆناغی یەکتر ناسین بۆ ئەوەی ماف‌و سنورەکانی خەڵکی تر بزانین‌و پێشێلی نەکەین، بەدەستهێنانی سۆزو خۆشەویستی خەڵك ئاسانە، بەڵام پارێزگاری لێکردنی زەحمەتە.

لە گرنگترین مافەکانی هاوڕێیەتی پاراستنی نهێنییەکانی نێوانتانە، خۆشەویستی‌و ڕێزگرتنیان بپارێزی، دوورکەویتەوە لە گاڵتەی ناشیرین‌و قسەی بریندارکەر، ئەدەب‌و ڕێزگرتن پێویستن لە گەڵ هەموو کەسێکدا تەنانەت خزمەکانیشت، تەنانەت ئەگەر لە ئاستێکی زۆر نزیکتدا بێت، هەوڵ بدە دوور بکەویتەوە لە خۆپەرستی، ئەمە وات لێدەکات خەڵك لێت دوور بکەوێتەوە، هەوڵبدە کۆنترۆڵی خۆت بکەو دوورکەویتەوە لە تووڕەبوون، نەرمونیانی سەرچاوەی بەختەوەرییە، چونکە نزیکت دەکاتەوە لە خەڵك لە دنیاداو لە خوداش لە ڕۆژی دوایدا.

# یاسای 10/90

ئامادەکردنی
ئەسکەندەر رەحیم رەشید

لــەم جیهانــەدا ملیۆنــان کــەس بــە دەردی خۆپڕوکانــدنو شــەکەتکردنی بــێ پاســاوەوە دەناڵێننو بە دەســت گوشــاری کێشــەی ســادەوە گیریانخواردووە.

یاســای (١٠/٩٠) یاســایەکی سەرســوڕهێنەرە، کەسانێکی کەم شارەزای ئەم یاسایەنو لە توانایاندا هەیە جێبەجێی بکەن. ئەم یاسایە زانای بەناوبانگی ئەمریکی (ستــیفن کۆڤی) دایناوە، کە خاوەنی دوو کتێبی گرنگی جیهانییە، کە بریتین لە:

١- حەوت نەریتی کەسانی کاریگەر.

٢- نەریتی هەشــتەم لــە کاریگەرییەوە بەرەو گەورەیی. ئومێد دەکەم ئەم کتێبانە وەربگێڕدرێنە سەر زمانی شیرینی کوردی.

ستــێفن کۆڤی ســەبارەت بەم یاسایە دەڵێت: گــەر فێــری بوویت ژیانت، یان هــەر هیچ نەبێت کاردانــەوەت بەرامبــەر چەنــد هەڵوێســتێکی دیاریکراو دەگۆڕێت.

ئەم یاسایە دەڵێت: لە ١٠٪ ژیان لەو ڕووداوانەی بۆمــان دێنــە پێــش پێکدێــتو لــە ٩٠٪ دیکەی کاردانەوەکانمــان تەواوی دەکــەن. کورتتر بڵێین: دەوروبەر (١/٩) لە دە بەشــی ژیانــت، یەك بەش کاریگەرییان لەســەرت هەیە، بەڵام نۆ بەشــەکەی دیکەی خۆت کاریگەریت لەسەر خۆت هەیە.

ئــەم یاســایە بەســەر کاردانەوەکانمانــدا دەچەســپێت. چونکــە ئێمە ناتوانین دەســتکاری گڵۆپــی ســووری هاتوچۆ بکەین، بــەڵام دەتوانین بەســەر کاردانەوەکانمانــدا زاڵ بــین. لەبەرئەوە مەهێڵــە کەســانی دیکــە، وات لێبکــەن گێلانــە بجوڵێیتەوە، بڕیاری کاردانەوەی گونجاو لەدەســت خۆتدایە.

بانموونەیەك بهێنینەوە..

خەریکــی خواردنی ژەمی بەیانیــت، منداڵەکەت لــە نــاکاو پیاڵەیــەك چــا -کــە لــە لێــواری مێزی نانخواردنەکەدایە- دەرێژێت بەســەر ئەو کراســەی لەبەرتکردووەو بە نیازیت پێیەوە بچیت بۆ سەر کار.

ئــەوەی لێرەدا ڕوویدا، هیچ دەســتی تۆی تیا نەبوو.. بەڵام ئەوەی دواتر ڕوودەدات، بەرەنجامی کاردانــەوەو هەڵچوونــی تۆیە: ســەیرێکی خۆت دەکەیتو سەرێك هەڵدەبڕیت، وەك فیشەکە شێتە دەچیت بە ئاســماندا، دەســت بە هــاتو هاوارو بۆڵە بۆڵو قســەی ناشیرین دەکەیتو سەرزەنشتی منداڵەکــە دەکەیــت، منداڵەکــەت دادەگریتەوەو دەیخەیتــە گریان.. ئینجا لەســەر ئــەوەی پیاڵە چایەکەی لە لێواری مێزەکەدا داناوە، ڕووی دەمت دەکەیتــە خێزانەکــەت، بەســەریدا دەقیژێنیتو کارێکی پێدەکەیت با بەدەواری شڕی نەکردبێت.. پــاش ئەم دەمە بۆڵــەش، دەڕۆیت تا کراســەکەت بگۆڕیــت.. پاشــتر دەگەڕێیتەوە، ســەیر دەکەیت منداڵەکەت لەبەر گریــان، هەم نانی نەخواردووە، هــەم خــۆی ئامــادە نەکــرووە بــۆ قوتابخانە.. ناچاریت بۆئەوەی هێندەی دیکە دوانەکەوێت، بە ئۆتۆمبێلەکــەی خۆت بیگەیەنیت.. بەهۆی ئەوەی پەلەتە، ئۆتۆمبیلەکەت زۆرتر لەخێرایی یاســایی لێدەخوریــت.. پۆلیســی هاتوچــۆ ڕاتدەگرێــتو پسوڵەی سەرپێچی کردنت بۆ دەکات.. کە دەگەیتە قوتابخانەی منداڵەکەت، چارەکێکە زەنگی چوونە پــۆل لێــدراوە.. منداڵەکەت دادەبەزێــتو بەرەو قوتابخانەکــەی ڕادەکات.. بێ ئــەوەی بڵێت: بابە خوات لەگەڵ.. تا دەگەیتە شوێنی کارت چارەکێکی دیکەت پێدەچێت، واتە نیو سەعات دوا دەکەویت.. پاشان سەیر دەکەیت جانتاکەشت لەبیرچووە.. ئەوە ڕۆژی خۆتە، بەشــێوەیەکی خراپ دەستی پێکردو بەردەوامیــش دەبێت لــە خراپەوە بــۆ خراپتر.. دوای گەڕانەوەشــت بۆ مــاڵ، دەبینیت پەیوەندی نێوان خۆتو خێزانو منداڵەکەت ئاڵۆزو شێواوە.. بۆچی؟ لەبەر کاردانەوە خراپەکانی بەیانیت!!

بۆچی ڕۆژەکەت ناخۆشو خراپ بوو؟ بەهۆی:
١- پیاڵــە چایەکەوە بــوو. ٢- منداڵەکەتەوە بوو.
٣- پۆلیسی هاتوچۆوە بوو. ٤- خۆتەوە بوو.

وەڵامی ڕاست/ خاڵی چوارەمە!

تــۆ هیچ تاوانێکــت لە ڕشــتنی پیاڵە چاکەدا نەبوو.. بەڵام کاردانــەوەت لە چەند چرکەیەکدا، ئەو ڕۆژەی لێشێواندیت..

پیاڵەیــەك چاییــت پیــا ڕژاوەو منداڵەکەت دەســتی کردووە بە گریان، چــی گونجاوە بکرێو پێویستە ڕوویدات؟

بــە نــەرمو نیانییەکەوە پێــی دەڵێیت: ڕۆڵە گیان هیــچ نییە ئەوەش دەبێت، بەڵام جارێکی تر زیاتر ئاگات لە خۆت بێت.. بە خاولییەك دەســتت دەســڕیتو خێرا دەڕۆیت کراســەکەت دەگۆڕیت، پاشــان جانتاکــەت هەڵدەگریــتو دەگەڕێیتەوە، دەبینیت منداڵەکەت خۆی گۆڕیوەو خەریکە بەرەو قوتابخانە دەچێت، دەســت هەڵدەبڕێتو ماڵاوایت لــێ دەکاتو دەڵێــت: بابــە گیان خــوات لەگەڵ.. پاشان بەرەو شــوێنی کارت بەرێ دەکەویت، پێش کاتــی دیاریکــراو دەگەیتە جێ.. بە ڕووخۆشــیو دڵخۆشــییەوە ســڵاو لە هاوکارەکانــت دەکەیت.. ئەوانو بەڕێوەبەرەکەت بە ڕووگەشــییەوە دەڵێن: چییە ئەمڕۆ دڵت زۆر خۆشە؟!

ئایــا جیــاوازی بــەدی دەکەیت؟ بەڵــێ دوو دیمەنــی جیــاواز دەبینــرێ، ســەرەتایان یەکەو ئاکامەکەیان جیاواز.. باشە بۆچی وابوو؟ بێگومان بە هۆی کاردانەوەی خۆتەوەبوو!!




درەخشان بەهادین

نموونەیەکی دیکە: پزیشك یەك کاریگەری لەسەر نەخۆش هەیە، نۆ کاریگەرییەکەی دیکە، دەکەوێتە سەر گوێڕایەڵی کردنی یان گوێڕایەڵی نەکردنی نەخۆشەکە خۆی بۆ ڕێنمایی پزیشکەکە..

هەروەها پەیوەندی مامۆستاو خوێندکار.. مامۆستا ١٠٪ کاریگەری هەیە لەسەر خوێندکار، ٩٠٪یش دەکەوێتە سەر خوێندکار.. واتە گەر خوێندکار لە پۆلدا گوێ بگرێت، ئەوا ١٠٪ ی نمرەکانی تاقیکردنەوە مسۆگەر دەکات، گەرچی هەوڵیش نەدات.. بەڵام ٩٠٪ی تاقیکردنەوە دەکەوێتە سەر هەوڵ‌و تێکۆشانی خۆی لە وانەکەدا...

لە ڕاستیدا تۆ هیچ دەسەڵاتێکت بەسەر ١٠٪ لەسەدا دەی ئەو کارانەی ڕوودەدەن نییە، بەڵام لە ٩٠٪ی دیکە لە ڕێگەی کاردانەوەکانتەوە دەستنیشان دەکرێ.

هەندێك ڕێگەی دیکە بۆ جێبەجێکردنی ئەم یاسایە:

گەر کەسێك خراپەی بەرامبەر کردی، وەك ئیسفەنج مەبە.. بەڵکو وەك پەنجەرە بە، کەلێزمەی باران بەسەریدا دادەبارێت.. ڕێگە نەدەی تانەو توانجی خراپ کارت تێبکات.. چونکە کاردانەوەی چاك ڕۆژت لێ تاڵ ناکات، بەڵام کاردانەوەی خراپ دەبێتە هۆی ئەوەی هاوەڵەکانت لەدەست بدەیت یان لە کار دەربکرێیت‌و مەستی پەستی ببیت.... هتد.

ئەگەر یەکێك بێتە بەردەم ئۆتۆمبیلەکەت، کاردانەوەت چۆن دەبێت؟ ئایا هزرو هۆشت لەدەست دەدەیت؟ ئایا بەتوندی دەست دەکێشی بە سوکانی ئۆتۆمبیلەکەتدا؟ قسەی ناشیرین دەکەیت؟ ئایا فشاری خوێنت دەچێتە سەر؟ ئەگەر دە چرکە درەنگ بکەویت، کێ یەخەت دەگرێت، کێ خەم دایدەگرێت؟

بۆیە هەردەم یاسای ١٠/٩٠ ت لە یاد بێت‌و لەوەی لەمەودوا بۆت دێتە پێش، پەست‌و پەرێشان مەبە، سەر لە خۆت مەشێوێنە..

گەر پێت گوترا: کارەکەت لە دەست داوە.. تووڕەیی‌و بێزاری‌و خەوزڕانی بۆ چییە؟ هێزو وزەی خەم‌و پەرۆشیت، لە دۆزینەوەی کارێکی دیکەدا بەکار بهێنە..

گەر پاسەکە درەنگ پڕ بوو، ڕێگە جەنجاڵ بوو، بەرنامەی ڕۆژانەتی تێکدا.. بۆچی جامی تووڕەییت پڕ دەکەیت، گەر بە کەسێکی تر دەکەیت‌و تووڕەییتی بەسەردا دەڕێژیت؟ یان ئاخۆ کاکی شۆفێر بەدەست خۆیەتی درەنگ دەگات، وا دەبۆڵێنی بەسەریدا؟ ئەو کاتە لە خوێندنەوە یان باسکردنی بابەتێکی بەسود بەسەر بەرە.. لەبەر ئەوەی شپرزەیی، جگە لە ئاڵۆزکردنی حاڵ‌و بارودۆخ‌و بەرەو خراپتر بردنی هیچی دیکەی لێ بەرهەم نایەت..

خوێنەری خۆشەویست ئێستا تۆ یەکێکی لەو کەسانەی ئەم یاسایە دەزانیت، هەوڵبدە لە ژیانتدا جێبەجێی بکە، چونکە شتێك لەدەست نادەیت‌و ئەنجامەکانی سەرسامت دەکات.

* فێربووم، کە شتانی کەم نرخ بناسم‌و دواتر ئەوان لەبەر چاو نەگرم.

* فێربووم، کە دۆڕان لە ڕووبەڕووبوونەوەیەکی بچووك بەنیبەتی برانەوە، لە بری شەڕێکی گەورە قبوڵ بکەم.

* فێربووم، کە دوو کەس دەتوانن پێکەوە تەماشای یەك خاڵ بکەن، بەڵام جیاواز بیبینن.

* فێربووم، بەس نییە تەنها لە بەرامبەرەکەم ببورم، بەڵکو هەندێ جاریش دەبێت لە خۆم ببورم.

* فێربووم، کە هیچ کەس ئەوەندە هەژار نییە کە نەتوانێ دڵی بەرامبەرەکەی شاد بکات‌و هیچ کەسیش ئەوەندە دەوڵەمەند نییە کە پێویستی بە زەردەخەنەیەك نەبێت.

* فێربووم، هاوڕێی چاك‌و ڕاستەقینە وەك خشڵ وایە، کە دەستخستنی دژوارەو پاراستنی دژوار تر.

* فێربووم، هەمووو دەیانەوێت لە لوتکەدا بژین، بەڵام بێ ئاگا لەوەی کە تەواوی شادییەکان کاتێ ڕوو دەدەن کە خەریکی سەرکەوتنیت بە لوتکەدا.

* فێربووم، کە ژیان لە سروشتەوە فێربم، وەك (بی) خۆ بەکەم زان، وەك (سەرو) بەژن ڕێکوراست، وەك سنەوبەر بە ئارام، وەك بەروو خۆڕاگر، وەك ڕووبار ڕوون، وەکو خۆر بەسەخاوەت‌و هەر وەك هەور بەرێزو گەورە.

سەرچاوە/ موفقیت.

# ٣٠ ڕێگا بۆ سەرکەوتن

١- متمانــە بەخۆبــوون: ســەرکەوتووەکان بەردەوام ئەوانەن کە باوەڕییان بەخۆیان هەیە.

٢- گوێنەدان بەوانەی کەویردی سەرزاریان ناکرێ‌و ناگونجێیە.

٣- ئەوە بزانە بەئەندازەی پێگیری‌و هەوڵت لەهەر بابەتێکدا ئەوەندەو زیاتر ســەرکەوتن بەدەست دەهێنێت.

٤- دڵنیابــە بەخــراپ‌و ســلبی ڕوانین لە خۆت هۆکاری فەشــەل‌و کەوتنتــە لە ژیاندا، هەر وەکو چۆن بە باشــی‌و سەیرکردنی خۆت باشترین پاڵنەری سەرکەوتنتە.

٥- بەردەوام بیربکەرەوە لەشتێك کە کەیف خۆش‌و بەختەوەرت دەکات، دووربە لە شتێك کە قەلەق‌و بێ تواناو بێ هێزت دەکات.

٦- ئاگاداربە ئەوەی لێی دەترسیت لەوانەیە رووبدات گەر بەردەوامبیت لەبیرکردنەوە لێی.

٧- خــۆت بەرابەرمەکــە بە کەســانی تر بەتایبەتی ئەوانەی کە دۆڕاو کەوتوون.

٨- گوێ لەو کەسانە مەگرە کە هەوڵدەدەن بــێ هیــوات بکــەن یا لــە ورەو توانــات کەم بکەنەوە.

٩- خاڵــە لاوازەکانــی خــۆت دیــاری بکــەو هەوڵبــدە خۆیــان لێدەربــاز بکەیت، خاڵــە بەهێزەکانیــش بزانــەو بەردەوامبــە لەسەرییان.

١٠- ترســانت لەهەوڵ‌و کۆششــی تازە بێ گومان ڕێبازی کەوتنتە.

١١- پشت بەخوابەستن‌و متمانە بەخۆبوون ڕێبازی سەرکەوتنتە.

١٢- ئەوانەی هەرگیز هەڵەناکەن ، ئەوانەن کەهیچ فێرنابن‌و هیچ کارێك ناکەن.

١٣- کەوتنــت بکە بەســەرەتایەکی نوێ بۆ هەستانەوەت لەمەیدانی ژیاندا.

١٤- هەوڵدان‌و ڕاپەڕین لە دوای کەوتن زۆر باشــترە لەوەی کە تەپ‌و تلتبێ‌و لەسەر زەوی بخولێیتەوە.

١٥- ئەگــەر هەولێکــی تــازە بدەیــت‌و هەڵــە بکەی بــۆ ئەوەی فێربیی، زۆر باشــترە لەوەی کەهیچ هەولێك نەدەیت‌و بانگەشــەی سەرکەوتن بکەی لەژیاندا.

١٦- پرســیار لــە خــۆت بکە لــەوەی لێی دەترســی پێش ئەوەی ئەنجامــی بدەیت بلێ: هیچ شــتێکم بۆ پێــش نایەت ئــەوە نەبێت کەخوا ئیرادەی کردووە.

١٧- ئــەوە گرنك نییە کــە خەڵك چۆن تۆ دەبینــێ، گرنك ئەوەیە کەچــۆن خۆت خۆت دەبینی.

١٨- بەختــەوەری پێوانــە ناکرێــت بەســەروەت‌و ســامان، هیدایــەت‌و ڕێبینــی بەختەوەری ڕاستەقینەیە.

١٩- قەیــران نییە تۆ کەمــت هەیە، بەس قەیران ئەوەیە کە پاڵنەرت کەمبێ.

٢٠- هەرگیز کێشەیەکت بۆ چارەسەرناکرێت کەنکوڵی لەبوونی بکەیت.

٢١- بە کەم ســەیرکردنت بۆ خەڵکانی تر هۆکارێکە بۆ تێکشکاندنی خودی خۆت.

٢٢- ئەگەر ڕێگە نەزانی بە باشــی ناتوانی بگەی بە کۆتایی.

٢٣- هەســت کردنــت بەتەنیایــی لــەوەوە سەرهەڵدەدات کە پەیوەندیت خراپە، پەیوەندی خراپ بوونت لەوەوە سەرهەڵدەدات کە مامەڵەت خراپە لەگەڵ کەسان‌و خەڵکانی تر.

٢٤- بــەردەوام ئێمە شــتەکان وەك خۆیان نابینــین، بەڵکو بەو شــێوەیە دەیــان بینین کە خۆمــان هەســتی پێدەکەیــن واقعی بەو بۆشتەکان بروانە بەبێ لایەنگیری.

٢٥- چارەســەری کێشــە لەناو کێشــەکەدا دەدۆزیتەوە هەربۆیە لەوێوە بۆی بگەڕێ.

٢٦- کەســی ئازادو سەربەخۆ ئەو کەسەیە کە دەڵێت: نا بۆ هەڵە...، بەڵێ بۆ ڕاستی...

٢٧- کاتێــك تێگەیشــتی لە مانــای بوونت لە ژیانــدا، ئەو کاتە دەزانی چــی بەلای تۆوە گرنگە.

٢٨- جوانی شــێوەو ڕووخســار بــەردەوام نابێت، بەڵکو ئــەوەی بەردەوام دەبێت جوانی ڕۆحە.

٢٩- گرنگتریــن هۆ بۆ فەشــەل‌و کەوتنت لەژیاندا دان نەنانە بە هەڵەکانتدا.

٣٠- ئیجابــی بەو بەباشــی بیربکــەرەوە، گەشــبین‌و ڕاســتگۆبە لەگەڵ خودی خۆت‌و دواتر لەگەڵ کەسانی تردا.



هاودین زانا

که له سەرەتای گەشـتی ژیانەوە ڕێکەوتم پێم وابو دەبێت بگەم، وەلێ وادەرنەچوو، نازانم ئەو گـورو تینه له کوێوە هـاتو تاکوێ بەش دەکات؟ هێزه شاراوەکانی مرۆڤ وا دەکەن خۆی له بالایدا ببینێتەوە، ئەمانه زۆر جار گرنگن‌و هەنـدێ جاری تریـش بێمانایيەکـی گەوره دەداتـه خودانـی بیرو هزری عەقڵ سـالارانە، ئەمانـه گرنگن یـان نا؟ بۆ تۆ بەڵـێ، وەلێ بۆ من نا... باشـه کەی بۆ مـن گرنگه بزانم پایز بـۆ بێحورمەتی به باخچه دەکات، کەی گرفتی منه بزانم لێکدانـەوەو لێدەرکردنی ژمارەکان ئاکامەکەی چییه؟ حورمەتی باخچه یانی چی؟ باخەوان تەورەکەی تیـژ بێت یان کول به من چـی؟ منی سـود بەخش ئەو چەمکـه بوو له فەلسەفەی بونگەراییەوە وەرم گرت هەرچەنده لـه ناخەوه بـه پوچگەرایـی سەرسـام بووم، وەلێ دوای خوێندنـەوەی (بێگانه)ی کامۆ ئەو سارسـامیەم نەما.. نەمویسـت کەشتیەوانەکه بکوژم بۆ ئەوەی خۆم دەرباز بکەم، بەڵام (ماری) لەناخمدا مایـەوە، منیش دوای مردنی هەموو شت تەنیا لەسەر سکی ماری هەستم به ئارامی کرد، لـه دوای مردنی خۆمـەوە تەنیا بۆ ئەو بۆینباخی رەشم له مل کرد وەك چۆن سورم بۆ پێشوازی له گەردن کرد... سەفەری دورگەکانی مردن مرۆیان بێزار دەکات، وەلێ لەگەڵ ماریدا هەرێمی مەرگه دەبێته ژوان... ئەو ئاسۆیانەی لـه دوای کامۆوە فێریان بووم منێکی تریشـم بۆ دۆزیـەوە (منی خۆم) (منی تـۆ)، ئەمانه بازنەو جوغزی ئینسـانین نەك شۆڕشگێڕی، کـه بەرزترین چەمکی ژیانه بـه لای منەوە، ئەمـەش وێك ناگرێتەوە لەگـەڵ (برێخت)دا، ئەمـه داهێنانی من نییـه، خوێندنەوەیەکی تره بـۆ شـانۆ نامـەی (جوغزی تەباشـیری قەوقازی) زۆر پێناس بۆ نیشتمان‌و زێد کران، وەلێ ئەوانیش کەوتنه هەمان خانەی پێناسی شـیعرەوە (فره ڕەهەندەو پێنـاس ناکرێت)، چەمکـی نیشـتمان دەکرێـت لـه دەرەوەی جوگرافیا قسـەی لێبکرێت، دەشبێت خۆت بۆ خۆتـی هەڵبژێریت نەك بۆت دیاری بکەن (یا وەك دەڵێن قەدەرت بێت) ئەم دەسـتەواژه له پەیوەندییه کۆمەڵایەتیەکانیشدا به کاردێت. دەکرێت نیشتمان لەناو هەرمێیەکدا بێت‌و به دارێکەوە که هەر خـۆت بزانی له کوێیه، ئەو کات به ئاسـانی خیانەتی لێناکرێت.. گەمه به چارەنوسی ناکرێت.

کۆمارێکی تەواو جیاواز لەوەی ئەفلاتون.. نه دەرت دەکەن‌و نەنامۆی تێیدا!! قسه کردن له چەمکی نیشتمان دەتخاته گێژاوی بیرکردنەوە له زۆر شـت، زمان، سیمۆلۆژیا، ئەبیستم .... بۆ ... نازانم ... سـەیرەەه! له نێـو هەریەکه لەم کایانەدا دەبێت سەر به ماڵی سۆسێرو چۆمسکی، بارت‌و درێدا، فەلسەفەو خێڵدا بکەی..

جیا لەوە نیشتمانێك که خۆت هەڵیبژێریت دەستورەکەشـی هەرخۆتان دەینوسـن (منی تۆ) (تـۆی من)، دەسـتور له زۆرێـك کاتاندا ماتماتیکه، فیزیك‌و کیمیایه..

ماتماتیکێکـی نوێ که تێیدا دەسـەڵات له یەکانەیی دەسـەنێتەوە، ئەمه حاڵی بنەڕەتی ناکۆکیەکانی ئایدیاو ماتریاله.

فیزیکێـك که لـه بنەرەتدا نـەك لەگەڵ نیوتنا ناکۆکه، بگره ئیسـحاقیش سـەری لێ دەرنەدەکرد!

فیزیکیسـتەکان لـەوە بێ ئاگـا بوون که هێزی ڕاکێشان له دڵدا زۆرتره تا له زەویدا...

له قۆناغی مێرد منداڵی‌و به ئێستەشەوە سەرسـامی تەنیا هاوکێشـەیەکی کیمیام، دوو گەرد هایدرۆجین‌و گەردێك ئۆکسـجین دەبنه بنەڕەتی ئاو!!!

هایدرۆجـین گازێکـه زوو دەسـوتێت، ئۆکسجینیش باشـترین یارمەتیدەری سوتانه، ئـەم دوو گازه گەرمـه ئاویان دروسـت کرد، به ئێستاشـەوە سەرسـامم‌و پێـم وایه تەنیا پێکهاتەی ئاوو عەشق لەیەك دەچن.

تۆم خۆش دەوێـت... ئەمەش له گەردونا فره جار روپامايیه، کێمان وەك هایدرۆجین‌و ئۆکسجین وازمان له سروشـتی خۆمان هێناو بووینه ئەنتی خۆمان؟

ئـەوەی ئەوان جوانترین خۆشەویسـتییه بەبێ هات‌و هاوار، بەبێ گریان..

گەمەیەکه بۆ رابردوو له ئێسـتادا دەست پێ دەکات، نزایەکـی جوانه که منداڵێك گریا من بۆ شـادی دەپارێمەوە جگه له شـادی چی هەیه منداڵ بۆی بگری؟

شـادیش لـه دوو بـازاری جیادا دەسـت دەکەوێت، لـه دوکانەکەی ئەو دیـو ژیانەوە، له کۆڵانەکـەی ئەمدیو مەرگەوە.... جوانترین دیارییـه بـۆ ئەوانەی خۆیان لـه کۆڵانەکانی وجود سەر دەر نابەن.

کام مەرگ... تۆ که نازانی بۆو کەی له دایك بوویت؟ نابێت نەزانی کەی خۆت دەمرێنیت!

میقدارێك درەنگ دەمرن... برێکیش زوو، کاتێ بمره که بمریت، ئەوانەی به کەماڵ گەشتون دەزانن کەی دەمرن، هەرمێ به دارەوە نازانێت کەی دەمرێت، زۆران بۆ گەشـتن به حەقیقەت زوو دەمرن، برێکیش بەر لەوەی پێی بگەن، من جیا لەوانه دەزانم کەی دەمرم، کاتێك قەناعەت به جلەکانم بکەم، به سـەعاتەکەم بڵێم نۆرەی پشـووە، کتێبی ژیانم تەواو کردبێت یان چەند لاپەڕەیەکی مابێـت، یان گۆڕەکەم بڵێت هاوڕێ چاوەڕێتم بۆ نەهاتی؟

وەك هەمـوو جار بۆ ئەوێـش ئیزنت لێ وەردەگرم.

نامق هەورامی

# دیوی دووەمی ئاوەز

هەردی غازی

# دەتەوێت

# بەڕاستی ژیان و حەوانەوەت دەستبکەوێت؟

**ئەگەر ژیانت دەوێت، ئەوا لەو کێشەو گرفتانەی کەدەکرێت چارەسەریان بۆ بدۆزیتەوە دەستەوەستان مەبە ئەگەر حەوانەوەشت دەوێت، ئەوا لەو کێشانەدا کە چارەسەر ناکرێت مەترسەو خەمبارمەبە "سەعیدی نوورسی"**

لە رووی بریسکەیەکی ئەم وتەیەوە چەند پرسیارێکتان ئاراستە دەکەین: هیچ کات روویداوە دڵگران بن بەوەی کە رەنگی قژتان بەدڵی خۆتان نیە؟ چەند جار سەیری باڵای منداڵەکەت کردووەو وتوتە: ئای لەخەفەتی ئەم منداڵە کە باڵای بەرز نابێت؟ قەد رووی نەداوە تەماشای تەلەفزیۆن بکەیت لەوکاتەی دەڵێ: دوای چەند ساڵی تر ئەستێرەیەکی کلکدار دەردەکەوێ، یاخود دەڵێ: دوای بیست بۆ سی ساڵی تر پلەی گەرمای زەوی بەرز دەبێتەوە؟ پاشان بێتاقەت بوبێتنو ترسابن لە ژیانی داهاتوتان؟

چەند جار توڕەبوویتو شەڕت بەمو بەو فرۆشتووە لەو کاتەی ئەو یانەیەی تۆ خۆشت دەوێت، دۆڕاوەو توشی سەرشۆڕی بووە؟

ئەمانەو سەدانو هەزاران پرسیاری تر کەدەکرێت، خۆتان لە خۆتانی بکەن...

پێش ئەوەی وەڵامی پرسیارەکانمان بدەیتەوە داوایەکمان لێت هەیە: پارچەیەك کاغەز بهێنەو لەناوەڕاستیدا ناوی خۆتی لێ بنووسە، پاشان چەند بازنەیەك بەدەوری ناوەکەتدا بکێشە، ئەم خشتەیە ناو بنێ پلانی کارو ژیان... کە ئەمەت تەواو کرد بزانە نزیکترینو گرنگترین شت چیە سەبارەت بە ژیانی تۆو خێزانەکەت.. کارگەکەت، دراوسێکەت، پۆستەکەت، بروانامەکەت، هەرشتێ کە بەلای تۆوە گرنگە، بەو پێوەرە لە یەکەم بازنەوە دەست پێ بکە هەتا کۆتا بازنە بەڵام لە کۆتا بازنەدا بنووسە گەردوون..

پرسیارێك لەخۆت بکە ئایا ئەو شتانەی تۆ پێیانەوە سەرقاڵی لەکام بازنەی ژیانی تۆدان؟ مامۆستایەك دەڵێ: «بچوکترین بازنە گەورەترین کارو گەورەترین بازنە بچوککترین کاری تێدایە».

ئایا کورتی باڵای منداڵەکەت، لە دەسەڵاتی تۆدایە؟ لەو باوەڕەدام هەمووتان بڵێن نەخێر، بۆیە دەڵێین کەواتە بازنەیەکی زۆر دوورە لە تۆوە.. ئەی بینینی ئەستێرەی کلکدار چ هێزێکی تۆی بەسەردا هەیە؟ کەواتە ئەمەیان زۆر زۆر دوورە لەتۆوە..

واهەستەکەم لە یەکەم بازنەدا شتێکت نووسیووە کە هێشتا لە پێشیەوە بازنەی نزیکتر هەیە!

ئەزیزم بیرت نەچێ یەکەم بازنە لەناو جەستەی خۆت دایە، دەتوانین بڵێین رۆحتە! ئەوەی گرنگە ئێمە بیزانین دەبێت کارەکانی ژیانمان بەپێی ئەو خشتەیە بەسەر ببەین، واتە هەموو کات لە نزیکترین بازنەوە دەست پێبکەین، ئەگەر هەرکاتێك خۆت لەم یاسایە دورخستەوە ئەوە دڵنیابە دوور یا نزیك توشی ئەنجامە خراپەکەی دەبیت، بۆ نمونە خوێندکار لەبازنەی خوێندندا، نزیکترین شت لێیەوەی هەوڵدانو خوێندنی وانەکانیەتی، بەڵام دەچێت باسی خراپی سیستەمو کەمتەرخەمی مامۆستاکەی دەکات، کارمەندێکی شارەوانی لە بازنەی کارەکەیدا پێویستترین ئەرك لەسەرشانی پاککردنەوەو پاکراگرتنی ژینگەیە ئەمە لەبیر دەکاتو گلەیی لەخەڵكو بەرێوەبەرەکەی دەکات، مرۆڤ لەبازنەی مرۆڤێتیدا ژیرانەترین کارو سودبەخشترینیان ئەوەیە کە فرمانەکانی خودا بەجێ بهێنێ، بەڵام ئەم ئەرکە سوکە لەبیردەکاتو دەڕوات خۆی لەکاری خودادا هەڵدەقورتێنێ، وەك ئەوەی دەڵێ: بۆ من نەخۆش دەکەوم، بەڵام فلانە کەس هەمیشە لەش ساغە؟ یاخود بۆ ئەو دەوڵەمەندەو من هەژار؟

ئەنجامی هەرسێ نمونەکە کە بازنە بچوكو نزیکەکانیان لەبیر کردو بۆ بازنەی دوورتریان رووانی ئەمەیە: خوێندکارەکە لە خوێندندا سەرکەوتوو نابێت، کارمەندی شارەوانیەکە بەهۆی تەمەڵییەوە دەردەکرێت یا سزادەدرێت، ئەو کەسەش کە خۆی هەڵقورتاندووە لەکاری خودادا توشی ناشوکری دەبێت، بۆیە سزایی ئەو هەڵەیەی دەچێژێت.

# پێنج ڕێگە بۆ گەیشتن بە خۆشبەختی

و/ هێرۆ موحەمەد ئەڵماس

5

هەندێك خۆشبەختی لە رابوردودا دەبیننەوەو هەندێکی دیکەش لە گەیشتن بە خۆشەویستومەعشوقدا، هەندێکی دیکە لە کردنەوەی پێشانگایەکی هونەریدا، بۆ هەریەکێك لە ئێمە خۆشەویستی مەدلول و واتایەکی تایبەت بەخۆی هەیە، هەندێجار بەدەستی دەهێنین و هەندێجاری دیکەش بێباکانە بەپاڵیدا تێپەڕ دەبین.

ئایا تۆخۆشەویستی بە بەخششێکی خوایی یان ئارەزوویەکی رۆحی دەزانیت؟ وەڵامی تۆ هەرچی بێت، گرنگ ئەوەیە کە بتوانیت پەروەردەی بکەیت و گەشەی پێ بدەیت.

خۆشبەختی، هەر رۆژو هەر سەعاتو هەر ساتێك لە سەرە رێماندایە، بە بوونی دیدێکی بەهێزو هەستێکی تیژو هەروەها خێرایی پێویست لە کاردا، بە ئاسانی دەتوانیت خۆشبەختی بەدەست بهێنیت، بۆ گەیشتن بە خۆشبەختی پێویستە رەچاوی چەند خاڵێك بکەیت:

١. عیززەتی نەفست هەبێت: هەندێ کەس هەن کە خۆیان بە بوونەوەرێکی بێ بەها دەزانن و لە بەرامبەریشدا کەسانێك هەن کە خۆیان وەك خەڵاتو بەخششێکی ئیلاهی دێتە پێش چاو، ئایا جیاوازی نێوان ئەم دوو کۆمەڵەیە چییە؟

هەبوونی "عیزەتی نەفس"و تێگەیشتن لە بەهاو نرخ و بەهای واقیعی خود دەبێتە هۆی گرتنە ئەستۆی بەرپرسیاریەتی ژیانی خودو خۆشبەختی بەبێ ئەوەی سەرزەنشتی کەسانی دیکە بکەین، هەر ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە لە بەرامبەر ئەو گیرو گرفتە نەبڕاوانەی کە لە سەرە رێماندا سەوز دەبن، رەفتارێکی ژیرانە بگرینەبەرو بە ئاسانی لێیان دەرباز ببین.

بەڵام ئایا چۆن دەتوانیت "عیزەتی نەفس" لە خۆتدا پەروەردەبکەیت؟ بۆ دەستپێکردن دەبێت چاوێك بە تۆمارو لیستی سەرکەوتنەکانتدا بگێڕیتەوە، ئەگەر لەو کەسانەیت کە پیشەتان وایە لەکۆتایی رۆژدا هەموو ئەو رووداوە ناخۆش و نەخوازراوانەی کە لە رۆژدا رویانداوە بهێننەوە بە بیرو زەینتاندا، بۆ نموونە بیر لە دۆسیەیەك دەکەیتەوە کە لە کارەکەتدا گرفتت هەیە لەگەڵیدا، یان کۆتایی هەفتەیەکی بارانی...و هەوڵ بدە ئەم عادەتونەریتەت بگۆڕە بۆ بیرخستنەوەی یادەوەرییە باشەکان و ئەو سەرکەوتنانەی کە بە درێژایی هەفتە بەدەستت هێناون، بۆ نموونە بیربکەرەوە لە رستەیەکی عاشقانە کە لە هاوسەرەکەت یان دەستگیرانەکەتەوە بیستووتە، یان بیر بکەرەوە لە پاداشتێك کە لە بەرپرسەکەتەوە وەرتگرتووە، بە ئەنجامدانی ئەم راهێنانە زۆر ناخایەنێت کە دەبینی لە کەسێکی رەشبینەوە گۆڕاویت بۆ کەسێکی گەشبین و پشت بەخۆبەستوو.

٢. لەگەڵ کەسانی دیکەدا پەیوەندیت باش بێت: هەندێجار خۆشبەختی مانای گرنگیدانە بەکەسانی دیکە، بۆ خۆشبەختی گرنگیدان بە کەسانی دیکە زیاد بکەو لە چاوەڕوانییەکانت بەرامبەر ئەوانی دیکە کەم بکەرەوە، بۆ خۆشبەختی نابێت هەمیشە بەدوای راکێشانی سەرنج و پاڵپشتی دەوروبەردابین، لەبری چاوەڕوانی یارمەتی وەرگرتن لەدەوروبەر پێویستە ئاگات لەدەوروبەرەکەت بێت و یارمەتییان بدەیت، بۆ نموونە لەهەر بۆنەیەکدا میوانداریەکی ئێواران یان عەسرانە رێك بخە، ئەم کارە بە کات و تێچونێکی کەم ئەنجام دەدرێت، تەنها ئەوەندە بەسە کە بەرێوە ببرێت، ئەو کاتە دەتوانیت باشترین کاتەکانت لەگەڵ دۆستان و ئازیزانتدا بەسەر ببەیت.

٣. لەو رووداوە بچوکانەی کە بۆ چەند ساتێك بزەو خەندە دەخەنە سەر لێوت، زۆرترین سود وەرگرە: ئایا دەزانیت کە خۆشبەختی لەژیاندا یەکسانە بە کۆمەڵێك خۆشی و شادی و چێژی بچوك؟ خواردنی قاوە لە قاوەخانەیەکدا لەگەڵ دۆست و هاورێیەکدا کە زۆرت خۆش دەوێت، دانیشتن لە ژێر هەتاوێکی پایزی، هەموو ئەمانە چەند ساتێکی شادو خۆشمان بۆ دروست دەکەن کە دەتوانن خۆشی و شادی بهێننە ژیانمانەوە. خۆشبەختی هەروەك تەندروستی وایەو ئاگاداری و بەدواداچونی رۆژانەی دەوێت، ئەڵبەتە مەرج نییە کە حەتمەن رووداوێکی باش رووبدات بۆمان تاوەکو چێژی لێ وەرگرین، بۆ دڵخۆش بوون دەتوانین لە خۆشی و شادی کەسانی دیکەدا بەشداری بکەین، لە بەرز بوونەوەی پلەی هاوکارەکەمان لەگەڵ ئەودا خۆشحاڵ بین و پێبکەنین و لەسەرکەوتنی منالی دراوسێکەمان لە پێشبڕکێیەکی وەرزشیدا، شادو دڵخۆشبین.

٤. لەگەڵ رابوردووی خۆتدا ئاشت ببەرەوە:

هەموو مرۆڤەکان بیرەوەری خراپ و ناخۆشیان هەیەو زۆرترینیان هەوڵ دەدەن لە رابوردووی خۆیان هەڵبێن، کەواتە لە هەر کاتێکدا لەوانەیە ئەم بیرەوەریە بێتەوە یادمان و ئازارمان بدات، بە رادەیەك هەندێ جاریش شوێنەوار لەسە ژیانمان بەجێبهێڵێت.

بۆ ئەوەی لە ئەزموونە تاڵەکانی رابوردوو کە وەك خۆرەیەك هەمیشە ویژدانت ئازار دەدات رزگاربېێت، هەوڵ بدە لەگەڵ رابوردوی خۆتدا ئاشت ببەرەوە، تەنانەت هەندێجار پێویستە لەبارەیەوە قسە بکەیت، ئەگەر لەگەڵ یەکێك لە خزم و ناسراوان یان دۆستان و هاورێیان کێشەیەکی ریشەییت هەیەو بووەتە هۆی ئەوەی کە قسەی لەگەڵ نەکەیت و پەیوەندی بپچڕێنیت، هەوڵ بدە بۆ ئاشت بوونەوە دەست پێشخەری بکەیت و رق و کینەی ئەو لە دڵتدا پاك بکەیتەوەو کاری خراپی ئەو لە ویژدانی بیرو هۆشتدا پاك بکەرەوە.

هەندێ جار ئەزموونە تاڵ و خراپەکانی رابوردوو لە زوڵم و ستەمێکەوە سەرچاوە دەگرێت کە لێمان کراوەو حەز ناکەین دۆست و ناسراوەکانمان هیچ شتێك لە بارەیانەوە بزانن، لەم کاتەدا پرس و راوێژو گفتوگۆکردن لەگەڵ دەروناس و راوێژکارێکدا دەتوانێت تاڵی و نارەحەتییەکانی ئەم ئەزموونە لە ناخماندا لەناو ببات، لەبیرتان بێت کە ئەزموونە تاڵەکانی رابوردوو دەبێتە هۆی شێواوی و شڵەژان لە مرۆڤدا، دواجار مرۆڤ لە سود وەرگرتن لە خۆشییەکانی ژیانی بێ بەش دەکات، کەواتە هەوڵ بدە بیرەوەرییە ناخۆشەکانی رابوردوو لەبیرو هۆشتدا بسڕەوە.

٥. هێزی داهێنانت گەشە پێ بدە: رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ گرفتەکانی رۆژانەداو بوونی ئەزموونی ژیان، دەبێتە هۆی ئەوەی کە لە ساتەکانی ژیان چێژو لەزەتی زیاتر ببینین. لەوانەیە بتوانین بڵێین بوونی هێزی داهێنان یەکێکە لە پلیکانەکانی گەیشتن بە خۆشبەختی.

بۆ خۆشبەخت بوون و دەرخستنی کەسایەتی خۆت هەبوونی ئەم تایبەتمەندییە پێویستە، هەستی وردەکاری لەخودی هەموو مرۆڤێکدا بوونی هەیە، کەواتە بۆ رازیکردنی ئەم هەستە هەوڵ بدە بەدوای دەستکەوتنی وەڵامی پرسیارە لە کۆتا نەهاتووەکانی بیروهۆشتدا بگەڕێ، ئەڵبەتە بۆ داهێنەر بوون پێویست ناکات زاناو بیریار بیت، دەتوانیت هێزی داهێنانکاری لە هەموو لایەنەکانی ژیانی رۆژانەتدا گەشە پێ بدەیت، بۆ نموونە ئەگەر ژنێکی خاوەن ماڵیت ئەوا دەتوانیت بۆ بوونی چەند ساتێکی لەیاد نەچوو لەگەڵ هاوسەرەکەتدا سفرەو خوانێکی نانخواردنی دوو کەسی عاشقانە رێك بخەیت و بۆ جوانکردنیشی سود لە هێزی داهێنانکاری خۆت وەرگریت.

نووسین یەکێکی دیکەیە لە رێگەو شێوازەکانی پەرەپێدانی هێزی داهێنانکاری، دەتوانیت بنووسیت و کەسانی دەوروبەرت لەبری کەسایەتیەکانی نووسینەکەت بەکاربهێنیت، یان دەتوانیت بەرنامەی گەشتێکی بەکۆمەڵ رێك بخەیت بە بێ ئەوەی پێویستت بەسەردانی نوسینگەی گەشتوگوزار هەبێت.

سەرچاوە/گۆڤاری: خانوادە ژ/ (٣٣٦)

# کچان و کوڕان لە نێوان ئازارو ئاواتدا

## تۆی یاخی دەتەوێت چی بکەیت؟!

زۆر جار روودەدات مرۆڤ لە بارودۆخی ژیانی بێزارەو رازی نییە بەو ژیانەی تێیدا زیندەگی دەکات، سەرەنجام یاخی دەبێت و دەیەوێت بە هەموو شێوەیەك لەو ژینگەیە قوتار بێت و بۆ ئەم مەبەستەش جەنگ بەرامبەر هەموو شتێك بەرپا دەکات!!

دەکرێت لەم پەیوەندییە تەلەفۆنییەدا لە نزیکەوە بە حاڵی ئەم جۆرە کەسانە ئاشنا بین، لەو پەیوەندییەدا گەنجێك بەم شێوەیە هاتە قسە:

پێم دەڵێن یاخی، نازانم بۆچی؟

لە هەر شوێنێك بم هەر پێم دەڵێن یاخی!

لە قوتابخانە، لە زانکۆ، لە ماڵەوە، تەنانەت لەگەڵ باوکیشمدا هەردەم بە کەسێکی یاخی ناوم دەبەن! لە هەمووی سەیرتر کاتێك دامەزرام هاوڕێکانم، تەنانەت بەڕێوەبەرەکەشم بە هەمان ناو ناوزەندی دەکردم!

بە منداڵی کەسێکی گێرە شێوێن بووم، بە هەرزەکاری هەمیشە دەم بەهاوارو گازندەو نارازی بووم لە باوکم و لە قوتابخانەکەم و ماڵەوەمان و شارەکەم، کاتی بە تاڵیم بە ئازاردان و گاڵتەکردن بە خەڵکی بەسەر دەبرد و هیچ گوێم بە خوێندنەکەم نەدەدا، زۆر شارەزابووم لە سەرپێچی کردنی سیستەم و رێورەسم و یاساکانی قوتابخانەو ماڵ و شەقامدا.

کاتێکیش لە زانکۆ بووم، تا نزیکی کاتی تاقیکردنەوەکان سەعیم نەدەکرد، رێزی مامۆستاکانم نەدەگرت، ئامادەی موحازەرەکان نەدەبووم، رابواردن و سەیرو سەفا ئامانجی سەرەکیم بوو، زۆربەی کاتەکان تورەو هەڵچوو بووم، هەمیشە خەوم بە تۆڵە سەندنەوەوە دەبینی لە هەموو کەسێك، تەنانەت لەوانەش کە هیچ ئازارێکی منیان نەداوە!

خەوی گەورەشم کۆچکردن بوو بۆ ئەمریکا تا بە ملیۆنەری یاخود بە ملیاردێری بگەڕێمەوەو خەڵکی بە پێکانم پان بکەمەوە!

کاتێکیش بۆ یەکەمجار لە وڵاتەکەمدا دامەزرام هەستم بەوپەڕی شکست و بێ هیوایی کرد، چونکە من هیچ کام لە هیواو خەونەکانم نەهێنابووە دی، هەمیشە رەخنەم دەگرت، لە هاوڕێکانم، بەڕێوەبەرەکەم، بەڕێوەبەری گشتی، لە کەس رازی نەبووم، لەو مووچەیەش رازی نەبووم کە وەرم دەگرت، لە کاتێکدا زۆربەی لاوانی هاوتەمەنم خەویان پێوە دەبینی!

هەست دەکەم بەردەوام دەستم بەستراوەو کۆتم لە گەردنە، لەبەر ئەوەشە بەردەوام هەوڵ دەدەم ئەوەی لێم نزیکە بە هەموو شێوەیەك تێکی بشکێنم، چونکە وا دەزانم کە هەوڵ دەدات جڵەو کێشم بکات و فشارم بخاتەسەر تا سنورێك بۆ هەڵسوکەوت و ئاکارەکانم دابنێت، هەموو خەڵکی بە درۆزن و دووڕوو تاوانبار دەزانم!!

ئێستا هەموو خەون و ئاواتەکانم هەرەسیان هێنا!

هیچ کاتێکی خۆش لە ژیانمدا نەماوە تەنانەت بۆ ساتێکیش!

بە دەست ململانێیەکەوە دەناڵێنم لە ناخی خۆمدا لە نێوان بە ئەمریکی کردن و یاخی بوونی ئەو کۆمەڵگایەی تێیدا دەژیم!

بە دەست دیدێکی لێڵ و روانینێکی تەماوییەوە دەناڵێنم.

نازانم کێ راستەو کێ هەڵە؟!

تەنها ئەوەندە دەزانم کە لەو یاخی بوونەمدا جۆرێك لە بەگژا چوونەوەو بەرخودان دەبینم بەرامبەر ئەو هەموو فشارانەی دووچاریان دەبم یاخود دووچاریان بووم.

خوێنەری ئازیز، دوور نییە ئەم وێنەیە گوزارش لە ژیان و گوزەرانی زۆرێك لە گەنجان و لاوانمان بکات، کە تەنها رێگایەك هەڵی بژێرن بۆ بەگژاچوونەوەی واقیع یاخی بوون و رەفزکردنی دەوروبەرە. لە کاتێکدا وەکو دەبینن ئەم کارە پێی ناگوترێ یاخی بوون، یاخود بە گژاچوونەوەی واقیع و هەوڵدان بۆ گۆڕینی، بەڵکو بریتییە لە بێ هیوایی و رەشبینی و ونبوون و متمانە نەبوون بە خودو نەبوونی ئایدیاو روانین و دیدێکی روون، گوزارش لە نەبوونی ئامانج و بێ پەیامی دەکات لە ژیاندا، گوزارشە لە ژیانی ئەو مرۆڤەی کە خۆی ونکردووەو نازانێت نهێنی بوونی چییەو بەرەو کوێ دەچێت و

پێویستە چی بکات؟!
دەکرێت بپرسین یاخی بوون لە واقیع و بە گژاچوونەوەی چۆن دەبێت؟!
دەتوانین نموونەی ئەو لاوە یاخییە لە د. مهاتیر محمد دا بدۆزینەوە کە لاوێکی مالیزییەو لە ساڵی (١٩٧٠) کتێبێکی نووسی بە ناونیشانی (بەڵای مالایۆ) لەو کتێبەیدا بە توندی رەخنەی لە گەلەکەی خۆی (مالایۆ) گرتبوو، تیایدا بە تەممەڵی و رازی بوون بەوەی مالیزیا وەکو دەوڵەتێکی کشتوکاڵی و دواکەوتوو بمێنێتەوە، بێ ئەوەی هەوڵی پەرەپێدانی بدرێت، تۆمەتباری کردبوون!
پارتی دەسەڵاتداری مالیزیا کە ناوی (رێکخراوی مالایۆی نەتەوەیی یەکگرتوو) بوو، بریاری قەدەغەکردن و یاساغ کردنی ئەو کتێبەی دا، بەهۆی ئەو بیرورا توندوتیژانەی کە لەو کتێبەدا هاتبوو بە بۆچوونی ئەوان! (مهاتیر محمد)یش لە دیدی ئەواندا جگە لە لاوێکی یاخی کە پێویستە کتێبەکانی یاساغ بکرێت چی دی نەبوو!!
بەڵام زۆری نەبرد توانی قەناعەت بە سەرانی حیزب بکات کە بروایان بە تواناو لێهاتووی ئەو لاوە هەبێت، توانی لە ئاسمانی سیاسەتدا ئەستێرەی هەڵکشێ و سەرەتا دامەزرا بە وەزیری پەروەردەو فێرکردن و پاشان لە ساڵی (١٩٨١)دا بوو بەسەرۆك وەزیرانی مالیزیا، بێ هیوا نەبوو، تووشی پێکدادان و بەرەو رووبەرووبوونەوە بوو، شۆرشگێرێکی توندوتیژو هەڵەشە نەبوو، بەڵکو چاکخوازێك و چاکسازێکی هێمن و لەسەرخۆ بوو!
هەر بۆیە ئەم لاوە یاخییە توانی رێژەی هەژاری لە (٥٢٪) لە ساڵی ١٩٧٠دا کەم بکاتەوە بۆ لە (٥٪) لە ساڵی ٢٠٠٥دا.
ئەم لاوە یاخییە ناوەندی ئاستی بژێوی تاکی لە (١٢٠٠$) لە ساڵێکدا لە ساڵی (١٩٧٠) بەرزکردەوە بۆ (١٠٠٠٠$) لە ساڵی (٢٠٠٢)دا.
ئەم لاوە یاخییە رێژەی بێکاری دابەزاند بۆ (٣٪)، لە دە ساڵی سەرۆکایەتی حکومەتدا رێژەی گەشەسەندنی ئابوری لە (٦,٧٪) تا (٧,١٪) بەرزکردەوە.
ئەم لاوە یاخییە پایتەختی وڵاتەکەی لە پایتەختی قورەوە گۆری بۆ پایتەختی رووناکی ئاسیایی!
ئەم لاوە یاخییە بەرنامەیەکی بۆ ئایندە داناوە کە تیایدا:
ساڵی (٢٠١٠): هەموو قوتابخانەکانی مالیزیا بە سیستەمی قوتابخانە ئەلیکترۆنییە زیرەکەکان کاردەکەن تەنانەت گوندە دوورەکانیش.
ساڵی (٢٠١٥): هیچ هاوڵاتییەکی مالیزی پارە لە باخەڵیدا هەڵناگرێت بە پشت بەستن بەو کارتە ئەلیکترۆنییەی کە ناسنامەو مۆڵەتی شۆفێری و هەموو زانیارییەکانی لەخۆ گرتووە، وێرای راکێشان لە باڵانسی حسابی بانکی.
ساڵی (٢٠٢٠): هەموو ئۆتۆمبێلەکان لە رێگای مانگی دەستکردەوە تۆمار دەکرێت و شوێنی هەموو ئۆتۆمبێلەکان دیاری دەکرێت لەو رێگایەوە.
ساڵی (٢٠٢٠): باوکان دەتوانن شوێنی منداڵەکانیان بزانن و شوێنەکانیان دیاری بکەن لە رێگای مانگی دەستکردەوە.
ئەم لاوە یاخییە توانی مالیزیا بگەیەنێتە ژمارە (١٨) لە نەخشەی پیشەسازی جیهانیدا.
ئەم لاوە یاخییە توانی رێژەی هەناردەی پیشەسازی بگەیەنێتە (٨٥٪) کۆی بەرهەمی مالیزی و لە هەموو ئەو سەد ئۆتۆمبێلەی کە بە شەقامەکاندا دەرۆن تەنها (٢٠٪) لە دەرەوە هێنراون!
ئەم گەنجە یاخییە گرێی (بە ئەمریکی کردنی) نەبوو، ئایا تۆش یاخیت وەکو ئەو؟!
ئەم لاوە یاخی بوو بۆ سەرخستنی وڵاتەکەی و بە ئاگا هێنانەوەی لە خەوی غەفڵەت، ئایا تۆش یاخیت وەکو ئەو؟!
دەکرێت گەنجان و لاوانی ئازیز ئەو پرسیارە لە خۆمان بکەین، کە ئایا ناکرێت گەنجێکی یاخی کوردیش (بەڵای کورد) بنووسێت و دەستی ئەم میللەتە لێقەوماوە بگرێت بەرەو کەناری دڵنیایی و ئاسوودەیی و چی تر لە زەلکاوی دواکەوتن و گەندەڵی و مشەخۆریدا پەلەقاژە نەکەین؟!
ناکرێت لەسەر دەستی یاخییەك دووبارە تاکی کورد فۆرمات بکرێت و ببێتە تاکێکی رۆشنبیرو سەربەخۆو وڵاتپەروەرو خاوەن بنەماو بەهاو رێبازی بڵند؟!
ناکرێت لە پاشکۆیەتی و ونبوون و گاڵتەجاری قوتاربین و پێگەیەك بۆ خۆمان لەسەر نەخشەی جیهان دروست بکەین؟!
ناکرێت حیسابێك بۆ خۆمان و وزەو تواناو داهات و وڵاتمان بکەین، تا خەڵکیش حسابمان بۆ بکات!!
بۆچی نا؟! ئەی لاوە یاخییەکە؟! بۆچی نا؟!
با ئێمەش لاوانی یاخیمان هەبێت، بە دڵسۆزانەو هێمنانە بەیداخی یاخی بوون بەرامبەر ئەم واقیعە تاڵ و دژوارە هەڵکەین!!
دە تۆ ئەو لاوە بە، ئەو گەنجە یاخییە بە، بزانین دەتەوێت چی بکەیت؟!



# ئاسۆی وێنەیەك



سەرنجی ئەم وێنەیە بدەو بە دیدو خەیاڵی تیژو هەستی ناسکت بۆی بنوارەو پاشان خامەکەت هەڵبگرەو گوزارش لەو هەستە ناسکو خەیاڵە وردو سۆزە بێ سنوورەت بکە، تا ببیتە خاوەنی یەکێك لەم دوو خەلاتەی خوارەوە:

- بەشداری بێ بەرامبەری ساڵێکی گۆڤاری بڕیار.
- بەشداری بێ بەرامبەری شەش مانگی گۆڤاری بڕیار.

دووا مۆڵەتیش بۆ وەرگرتنی وەڵامەکان (١٠) رۆژ دووای دەرچوونی گۆڤارەکە.

## خەلاتی یەکەم
## سروە سەعید



لەناو شاخو بەردەلانا
لەناوجەرگەی کوردستانا
چوزەرەی هیوایەکی نوێم
هێدی، هێدی
ورد لەسەرخۆ
بەرەو نیگای چاوەڕوانی
ئێوەی ئازیز
هەنگاوەنێم
هاتووم
سرودی ژینی نوێ
بدەم بە گوێچکەی جیهانا
پەیامێکی زیندووم پێیە
هێزو وزەو باوەڕی
لە بن نەهاتووی
نەوەی نوێیە!
کێ وەکو من کۆڵنەدەرە
سروەی بەربەیانی پێیە؟
کێ وەکو من راستی بێژە
مژدەی رزگار بوونی پێیە؟
کێ وەکو من
دڵی پڕی لە خۆزگەیە؟
هەمیشە سەرلێوەکانی
هێلانەی
بزەو خەندەیە؟
بۆ شەوی
تارو درێژی
ئەم شەوگارە
کێ لە دور را
چرای پڕ لە نووری پێیە؟
کێ لە مشتی
رەقو تەقی بەردەلانا
لە نێو باوەشی
زستانا
چرۆی دەرکرد؟
دەست لە مل بوو
لەگەڵ
هەوڵو تێکۆشانو
کۆڵنەدانا؟!

# راهێنانی مێشك

**بە وردی لەم وێنەیە ورد بەرەوەو**
**هێزی مێشكو بیركردنەوەت**
**بخەرەكار، بزانە چی دەبینیت؟**
**تا چ رادەیەك دیدی تێروانینت وردە؟**

## خەڵاتی دووەم
## ئەنەس عەلی

رێگەی ژیان پڕهەورازە
ئاراستەی شادی بناسە
راستە رێی ژیان دژوارە
بەڵام شادی دوا هەوارە
بەكۆڵنەدانی بێ وچان
ئاوەدان دەكەی رێبازی ژیان
بەردو نشێوی رێگا نامێنێ
سود بۆخۆیو خەڵكی دێنێ
بزانە بەرەو كوێ دەرۆی...
تەواو هەنگاو هەڵگرە بۆی
ژیریو توانات بخەرە گەڕ
هەڵبژێرە رێگای بەفەر
ئامانجت دیارو رۆشنبێ
بادووریشبێ هەر دەیگەیتێ
بەبەردەوامیو خەباتی تەواو
دەتوانی بەردی رەق بكەی بەئاو
یاخود دەتوانی لەزەوی دێمی
هەزاران جۆری نەمام بروێنی
گەر هەموودنیا بەردو رەقان بێ
نابێتە رێگر بۆ رەگی گوڵێ
مادام تۆوی گوڵ لەزەوی چوبێ
گەش دەبێتەوە درەنگ یازووبێ

**سوپاس بۆ ئەم بەرێزانەی**
**كە لە خوارەوە ناویان هاتووە،**
**بە شیعر یاخود پەخشان بابەتیان ناردووە بۆ ئاسۆی**
**وێنەی ژمارە (١٣)**

١- شارا حەمە عەلی.
٢- موختار حەمە نوری -هەڵەبجەی شەهید.
٣- دلێر حەمە ئەمین - هەریر.
٤- شوان ئەحمەد - بەستەسێنی رانیە.
٥- ئیبراهیم باوایی.
٦- مەهدی قادر.

دەستان خۆش
چاوەڕوانی بەرهەمی نوێتانین.

ئاگاداری خوێنەرانی ئازیز دەكەینەوە كە گۆشەی (بە هێمنی) بەردەوامەو لە ژمارەی ئایندەوە جارێكی تر دەبێتەوە میوانتان

# سەرەتا لە دەروازەی سەرەکییەوە دەست پێبکە!!

ئا/ بەرزان ئەبوبەکر رەشید

پاشا (لویسی چواردەهەم) فەرمانی لە سێدارەدانی بۆ یەکێك لە زیندانییەکانی ئەو زیندانە دەرکرد، کە (لە قەدپاڵی چیایەکی دوور لە شاردا دروستکرابوو)، ئەو زیندانیەی کە فەرمانی لە سێدارەدانی بۆ دەرچوو بوو، تەنها یەك شەوی مابوو بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی لە سێدارەدانەکەی، واتە ئەو لە چاوەروانی ئەوەدا بوو کە سبەینێ کاتێك تیشکە وەنەوشەییەکانی خۆر قەدپاڵی چیاکە رووناك دەکاتەوە، دەبرێت بۆ بەردەمی پەتی سێدارەو لە گۆرەپانی شاردا بە دیار چاوی جەماوەرێکی زۆر لە کەس‌و کارو دۆست‌و خۆشەویستانی فەرمانی لە سێدارەدانی جێبەجێ دەکرێت، بارودۆخ بۆ کاکی زیندانی یەکجار خەمناك‌و دژوار بوو، جگە لە بیرکرنەوە لەو کارەساتە نەیدەتوانی بیر لە شتێکی دی بکاتەوە، چونکە ئەوە کۆتا رۆژی ژیانییەتی!

ئەم پادشایە واتە (لویسی چواردەهەم) هەندێك جار هەڵس‌و کەوتی نامۆو کرداری سەیرو سەرنج راکێشی ئەنجامداوە، هەر بۆیە ئەو شەوە (لویس) لەگەڵ پاسەوانەکانیدا چوو بۆ زیندان، زیندانییەکە بە هاتنی پادشا زۆر سەرسام بوو، ئەو لەوپەری نا ئومێدیدا بوو، پادشا رووی کردە زیندانییەکەو پێی وت: دەزانم سبەینێ بریارە لە سێدارە بدرێیت، بەڵام من دەمەوێت هەلێکت پێ ببەخشم، ئەگەر توانیت سوود لەو هەلە ببینی ئەوا تۆ رزگارت دەبێت‌و سبەینێ لە بری ئەوەی بچیتە بەردەمی پەتی سێدارە دەچیتەوە ناو کەس‌وکارو دۆست‌و ئازیزانت، لە بری خەمباری‌و شیوەن‌و گریان خەندەو خۆشییان پێشکەش دەکەیت، پاشان وتی: لەم زیندانەدا دەلاقەیەك هەیە بۆ رزگار بوون کە هیچ پاسەوانێکی لێ نییە، ئەگەر توانیت ئەو دەلاقەیە بدۆزیتەوە دەتوانیت بە ئاسانی بچیتە دەرەوەو ئازاد بیت، بەڵام ئەگەر نەتتوانی دەلاقەکە بدۆزیتەوە، ئەوا سبەینێ لەگەڵ هەڵهاتنی تیشکی خۆر پاسەوانەکان دێن بە شوێنتاو بەرێ دەخرێی بۆ بەردەمی پەتی سێدارە! پاشا وتی: هیوادارم بەخت یاوەرت بێت‌و بتوانیت ئەو دەلاقەیە بدۆزیتەوەو بە ئازادی لە زیندان بچیتە دەرەوە.

پاشا دوای ئەم وتانەی زیندانەکەی جێهێشت‌و هاتە دەرەوە، کاتێك گەیشتە دەرگای زیندانەکە قوفڵی دەرگاکەی بە کراوەی جێهێشت‌و فەرمانی کرد ئەو شەوە پاسەوانەکان زیندان جێبهێڵن‌و کەس لەو ناوچەیە نەبێت.

زیندانییەکە بیری لە وتەکانی پاشا دەکردەوە، زۆر دڵنیا بوو لەوەی کە پاشا راستگۆیەو ئەو قسانەشی بە راست بووەو گاڵتەی پێناکات، هەروەها دەیزانی کە چەند جاری تریش پادشا ئەو جۆرە مامەڵانەی لەگەڵ زیندانییان کردووە، لەم کاتەدا زیندانییەکە جگە لە هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی ئەو دەلاقەیە چارەیەکی تری لە بەردەمدا نەبوو، هەر بۆیە دەستیکرد بە هەوڵدان‌و گەران بۆ دۆزینەوەی دەلاقەکە، زیندانەکە لە چەند سووچ‌و ژوورێکی پێچاوپێچ پێکهاتبوو، گەران بە نێو زیندانەکەدا دژواربوو، لەگەڵ ئەوەشدا کاتێکی زۆر کەمی بە دەستەوە مابوو، بە هەرحاڵ کات چاوەرێ ناکات‌و بەشێوەیەکی خێرا تێدەپەرێت، لە یەکەم هەنگاوی گەرانیدا هیوایەك دەرکەوت، دەلاقەیەکی داپۆشراوی لە

ژوورێکی زیندانەکەدا دۆزییەوە، رووپۆشەکەی لابردو پلیکانەیەکی بینی کە لە رێیەوە دەکرا بچیتە خوارەوە، کاتێك چووە خوارەوە کۆمەڵە پلیکانەیەکی دیکەی بینی کە بەرەو سەرەوەی زینـــدان دەرۆیشـــت، چووەســـەرەوە، پاشـــان پلیکانـــەی تری بینـــی، پاشـــان پلیکانەیەکی تـــر، بەمجۆرە بەردەوام بوو لە ســـەرکەوتن تا گەیشتە شـــوێنێك هەستی کرد بە شنەبایەکی فێنك کە دڵنیابوو ئەوە هەوای فێنکی دەرەوەی زیندانە، ئەمەش زیاتر هیوای لا دروســـتکرد، بەڵام هێشـــتا پلیکانەکان کۆتاییان نە هاتبوو، بە هیـــوای دۆزینەوەی دەلاقەکـــە ماندوویێتی نەدەناســـیو بەردەوام ســـەردەکەوت، تا خۆی بینییەوە لە کۆتایی لوتکەی قەڵایەکی یەکجار بەرز بە ئەندازێك بەرز بوو کە رادەی بینینی چاوەکانـــی نەیـــان دەتوانـــی دامێنـــی قەڵاکە ببینن، ماوەیەك بە سەرسامی مایەوەو هەڵێکی دیکەی بۆ دەربازبوون شـــك نەدەبرد، پاشـــان زۆر بە خەمباریو بەوپـــەڕی نا ئومێدییەوە بە شـــوێنی خۆیدا گەڕایەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەر دڵنیابوو کە پاشـــا فێڵی لێ ناکاتو بوونی ئەو دەروازەیە راستە!

زۆر بـــە مانـــدویو خـــەمو پەژارەیەکـــی زۆرەوە لە نێو زیندانەکەدا راکشاو لە حەسرەتا قاچەکانی دەکێشـــا بە دیواری زیندانەکەدا لە ناکاو هەستی کرد بەردێکی دیواری زیندانەکە جوڵا، کاتێك دەســـتی دایە بەردەکەو دەریهێنا لـــە نێـــو ریـــزی دیوارەکـــە، ژێـــر زەمینێکی تەسکی بینی، کە نەدەتوانرا بە ناویدا برۆیت تەنها بە ســـنگە خشـــکێ نەبێت، لەبەرئەوەی چارەیەکی تری نەبوو، بە ســـنگە خشـــکێ بە ژێرزەمینەکـــەدا ملی رێگەی گـــرت، بەردەوام بوو لە رۆیشـــتن تـــا گوێچکەکانی بـــە هاژەی ئـــاو زرنگایـــەوە، هیوایەکی هاتـــەوە بەر، ئەو وا هەســـتی کرد قەڵاکە تەنیشتی رووبارەکەی بە تاڵەو بە ئاســـانی دەتوانێـــت لەوێوە دەرباز بێت، بەڵام پەنجەرەیەکی ئاســـنینی داخراوی بینـــی، دەیتوانـــی لەوێوە ســـەیری رووبارەکە بکات، بەڵام نەیدەتوانی دەرباز ببێت، پاشـــان بەردەوام بوو لە رۆیشـــتن تا گەیشـــتە کۆتایی ژێر زەمینەکە، بەداخـــەوە رێگەیەکی داخراو بوو! دەســـتی کـــرد بـــە جوڵانـــی بەردەکانی دەوروبـــەری بەو هیوایەی دەروازەیەکی دیکە ببینـــێ، بەڵام هەمـــوو هەوڵەکانی بـــێ ئاکام بوونو لە هەمان کاتدا شـــەو بەرەو لەت بوون دەچـــوو، لەگەڵ هەموو ئەمانەشـــدا بەردەوام لـــە هەوڵو گەڕاندا بوو، لە هەموو گەڕانێکیدا هیوایەکی نوێی بەدی دەکرد، بەڵام سەرەنجام هەستی کرد شکستی هێناوە لە دۆزینەوەی ئەو دەلاقەیـــەدا، ناچار گەڕایـــەوە نێو زیندانەکە، دوای هەوڵدانێکی زۆرو بێ ئاکام شەوگار وەکو شـــەوانی دی کۆتایـــی هاتو خۆر بە تیشـــکە زێرینەکەی دونیـــای رووناك کردەوە، ئەویش لە نێو زیندانەکە بەوپەڕی خەمو پەژارەو بێ هیواییو دەروونێکی رووخـــاوەوە چاوەڕوانی هاتنی پاســـەوانەکانی دەکرد، چونکە دڵنیابوو لەوەی مۆڵەتەکەی کۆتایی هاتووەو نەیتوانیوە سود لەو هەلە وەربگرێ کە پاشا پێی بەخشی بوو، لەم کاتەدا پاشاو پاســـەوانەکانی دەرگای زیندانیـــان کـــردەوەو بینیـــان زیندانییەکـــە دانیشتووەو نەیتوانیوە دەروازەکە بدۆزێتەوە، بۆیە پاشـــا پێـــی وت: دەبینم لـــە نێو زیندان ماویت؟!

زیندانییەکـــەش هەناســـەیەکی قوڵـــی هەڵکێشاو وتی: لەو بڕوایەدا بووم کە تۆ راستگۆ بیت لەگەڵمدا! پاشا وتی: بەڵێ دڵنیابە راستگۆ بووم لە گەڵـــت! زیندانییەکە وتی: هیچ کونو کەلەبەرێکـــی ئەم زیندانە نەماوە من نەگەڕێم بە ناویدا، ئەو دەلاقەیە کامەیە کە تۆ بەڵێنت پێدامو وتت دەلاقەیەك هەیە دەتوانی لەوێوە دەرباز بیتو پاسەوانیشی لێ نییە؟!

پاشـــا زۆر بە ئارامییـــەوە وەڵامی دایەوە: دەروازەی سەرەکی زیندان کراوەبوو!!

کەواتە/

١- دەکرێـــت پێش ئەوەی کوێـــرە رێگاکان تاقـــی بکەینـــەوە، رێگە ســـەرەکییەکان تاقی بکەینەوە.

٢- کاتێك لە شـــوێنێك نیشـــتەجێ دەبیت ســـەرەتا بە نێو هەموو دەروازەو رێچکەکانیدا بگـــەڕێو شـــارەزای هەمـــوو دەروازەو کوێرە رێگاکانـــی ببە، ئەگەر پێشـــتر کاکـــی زیندانی هەوڵـــی بدایـــە لە هەمـــوو جێگەیەکـــی نێو زیندانەکەی شـــارەزا بێت، ئەو شەوە کاتەکانی لـــە گەڕانی بێ ئاکامدا بەســـەر نەدەبردو زۆر بـــە ئاســـانی دەیتوانـــی رێگە ســـەرەکییەکە بدۆزێتەوە.

٣- کاتێك کەســـێك قســـەت بـــۆ دەکات بە تایبەت بۆ کارێکی ئاوا چارە نوس ساز، زۆر بە وریاییەوە گوێی بۆ بگرە، ئەگەر ئەم زیندانییە بە دیقەتەوە گوێبیستی قسەی پاشا ببوایە لە مەبەســـتی تێ دەگەیشـــتو دەیزانی شوێنێك پاســـەوانی لێ بێ بەردەرگایە کەواتە ئێســـتا بەردەرگاکە چۆڵە بۆیە پاشا دەڵێت پاسەوانی لێ نییە.

* بیرکردنەوە لە دەرەوەی سندوقەکە!
* بیرکردنەوە لە رێگای نوێ!
* دەق نەگرتـــن بـــە یـــەك رێگـــای بیرکردنەوەوە.

سەرچاوە/ ئینتەرنێت.



## گەڕان بە دوای سکەیەکدا

رۆژێك کوڕێکی منداڵ، سککەیەکی یەك سەنتی دۆزییەوە، ئەو لە پەیدا کردنی سککەیەك ئەویش بێ هیچ زەحمەتێك زۆر شادومان بوو، ئەم تاقیکردنەوەیە بووە هۆی ئەوەی کە رۆژانی تری ژیانی بە چاوی کراوە سەر داخاتو بە دوای سککەدا بگەڕێت! کوڕە منداڵەکە لە ماوەی ژیانی (٢٩٦) سککەی یەك سەنتی، (٤٨) سککەی پێنج سەنتی، (١٩) سککەی دە سەنتی، (١٦) سککەی بیستو پێنج سەنتی، (٢) سککەی نیو دۆلاریو یەك دراوی کاغەزی دۆزییەوە، واتە بە گشتی (١٣) دۆلارو (٢٦) سەنتی دۆزییەوە، بەڵام لە بەرامبەر بە دەستهێنانی ئەو سەروەتە، جوانیو سەرنج راکێشی (٣١٣٦٩) هەڵاتنی خۆر، دەرکەوتنی (١٥٧) پەلکە زێرینەو جوانی درەختی (ئەفرای) لە سەرمای پایزدا لە دەست چوو، هەروەها ئەو هیچ کات ئەو پەڵە هەورە سپیانەی کە لە بەرزایی ئاسماندا دەجوڵانو باڵندەکانی لە کاتی فریندا نەدەبینی، ئەمە جگە لەوەی کە درەوشانەوەی خۆرو زەردەخەنەی هەزاران رێبوار، هەرگیز نەبوونە بەشێك لە یادگارییەکانی.

سەرچاوە/ ماهنامە/ موفقیت

# خێزانی بەختەوەر

پەری شێخ کەریم

## قەناعەت، ئەو گەنجینەیەی لەبن نایەت!!

یەکەم هەنگاو بۆ ئەوەی ببیتە ئافرەتێکی نموونەیی لە پێکهێنانو بەڕێوەبردنی ژیانی هاوسەرێتیدا، پێویستە لەسەرت دووربیت لەدەربڕینی نارەزاییی و سکالاکردن کە دەبێتە مایەی بێزارکردنی هاوسەرەکەت ، ئەگەر بەردەوام دڵت پڕ بکەیت لە رازی بوونو قەناعەت ئەوکات خودا دڵت پڕ دەکا لە خۆشیو ئارامی، بێگومانبە هیچ دڵێك شاد نیەو هیچ دەرونێك هێندەی ئەو دەروونە ئاسوودە نییە کە هەمیشە رازییە بە حاڵی خۆیو بەردەوام سوپاسگوزاری خودای لەسەردەکات.

بۆ ئەوەی ببیتە ئارامترین کەس، سەرەتا خودی خۆت برازێنەوە بە رازیبوونو قەناعەتکردن بەو ژیانەی کەسەرەتا مەرجی هاوسەرگیریتان لەسەر بنیات ناوە.

پێویستە ئافرەت ژیانی رۆژانەی بەسەربەرێت لەگەڵ ماڵو منداڵەکانیدا دوور لەدەربڕینی سکالاو رەشبینیو سەیری ئەو کەسانە نەکات کە لە سەرووی خۆیەوەن لە کارو باری دنیادا، چونکە ئەمە دەبێتە هۆی دڵتەنگیو نارەزایی دەربڕینو شێواندنی شیرازەی خێزانەکەی.

هەمیشە ئەونیعمەتانە وەبیرخۆت بهێنەرەوەو سوپاسی خوداو پاشان هاوسەرەکەت بکە، چونکە دەوڵەمەندی تەنها بە پارەو سەروەت نییە بەڵکو دەوڵەمەندی لە ئاسوودەییدا لەهەموو سەروەتی دونیا بە نرخترە بۆ ژیانت، بە رووکەشی ئەو کەسانە فریو مەخۆ کە خاوەن سەروەتن ئایا تۆ ئاگاداری لە نێو ماڵەکەیاندا چۆن ژیان بەسەر دەبەن؟ چۆن مامەڵە لە گەڵ یەکتریدا دەکەن؟

ئێمەلێرەدا مەبەستمان لەوە نییە کەبوونی سەروەتوسامان شتێکی خراپە، بەڵام خۆشبەختی خێزانەکەت زۆر لەوە گرنگترە، رازی بوونی خودا لێت زۆر گرنگترە، ئاسوودەیی دڵو دەروونت زۆر لەوە گرنگترە، راحەتی بیرو بۆچوونت زۆربەبایەخترە، بایەخدانت بە بەرەو پێشچوونی منداڵەکانت زۆر گرنگترە، رۆژانە سەیری بەرنامەی ژیانی خۆت بکە بزانە چ کارێکت ئەنجامداوە بۆ بەرەو پێشبردنی خێزانەکەت، نەك ژیانت تاڵ بکەیت بە نارەزایی دەربڕین، زۆر جارسکالاکانت بە جۆرێکن کە لەگەڵ توانای هاوسەرەکەتدا ناگونجێت، رەنگە زۆر جار توانای ماددی هاوسەرەکەت نەتوانێت هەموو کەموکوریو نارەزاییەکانت بۆ جێبەجێ بکات.

تەنها لێرەدا مەبەستمان لە ئافرەت نییە بەڵکو پیاویش بە هەمان شێوە لێپرسراوە لە جێبەجێکردنی کەموکوری خێزانەکەی تا رووبەرووی کێشە نەبێتەوە، ئافرەتیش دەبێت ببێتە یارمەتیدەری هاوسەرەکەی، نەك بە پێچەوانەوە لە کاتی گەرانەوەیدا هەموو کێشەکانو کەموکورییەکان رووبەرووی هاوسەرەکەی بکاتەوەو ماندوویەتی خۆی بە هۆی ئیشو کارەوە بەسکالاکردن بەسەر هاوسەرەکەیدا دەربڕێت.

دکتۆرە لورا شلنجر کە خاوەنی کتێبی (اِکتشفی السعادة الزوجیة) پێشکەشکەری بەرنامەیەکی رادیۆییە لە ئەمریکا بۆ چارەسەرکردنی کێشە خێزانیەکان دەڵێت: ئافرەتێك تەلەفونی بۆ کردمو بەم شێوەیە باسی لە ژیانی خۆی کرد:

من ناوم (کاسی)یە لە تەمەنی (٢٥)ساڵیدا چوومە نێو ژیانی هاوسەرییەوە، بەراستی لە واقیعی ژیان تێنەگەیشتبووم بۆیە ژیانم بە هیلاکبردنی خۆمو ماڵەکەمو منداڵەکانم بەسەر برد، کاتێك هاوسەرەکەم بەو پەری ماندوێتییەوە دەگەرایەوە لە کار، تەنها قسەکانم بریتی بوون لە بۆڵە بۆڵکردنو نارەزایی دەربڕین لە ماڵو منداڵ، هەمیشە سکالام دەردەبری بۆ ژیانم کە لە راستیدا بەو شێوەیەش نەبوو! بەڵام نائارامی خۆم ئاسوودەیی ژیانی لێ تێکدام، دان بەوەدا دەنێم کە بەردەوام بە جۆرێك پێشوازیم لێ نەکردووە کە ماندوێتی لە بیربەرمەوە! رۆژێك دانەنیشتم لە تەنیشتییەوە کە پرسیاری ئیشو کارەکەیو ژیانی رۆژانەی لێ بکەم ، بێهۆش بووم لە هەستو سۆزی هاوسەرەکەم، دوای ئەوەی ژیانی خۆمو منداڵەکانم تێکدا. ئەی خودایە، ئەگەرتەنها بایەخم بە ئەو بدایە هەروەك چۆن بایەخم بە سکالاکردن دەدا بەم دەردە نەدەچووم. ها ئەوەتا ئێستا تەمەنم گەیشتۆتە ٤٠ ساڵی پێت دەڵێم: کە بە راستی رقم لە خودی خۆمە کە خۆپەرستو بێ ئەقڵ بووم، ئەی خودایە ئەم هەڵەیەی من بکەیتە وانەیەك کە لە بیر نەچێتەوەو ببێتە وانەیەك بۆ ئەو کەسانەی کەلەم کێشەیەدان).

دکتۆرە لورا: پاش ئەوەی کە (کاسی) جارێکیتر هاوسەرگیری کرد، بەڵام ئێستا لەگەڵ ئەم هاوسەرەیدا ژیانی زۆر جیاوازە، بەردەوام لەبارەی کاروبارەکانی پرسیاری لێدەکات، ئایا ئەو رۆژەی چۆن بەسەر بردووە؟ هەمیشە هەوڵ دەدات کەپرسیار لە ژیانی رۆژانەی بکات هەتا بایەخو خۆشەویستی خۆی دەربخات لەلای هاوسەرەکەی، ئێستا گەیشتوومەتە ئەو بروایەی زۆربەی ئافرەتان بێ ئاگان لە هەڵەکانی خۆیانو بەردەوام ژیانی خۆیان تێکدەدەن، زۆر جارلە رێگای بەرنامەکەمەوە ئامۆژگاری ئافرەتان دەکەم لە باتی هاوارو سکالا کردن کە زۆر جار بەهۆی شتێکی بچوکەوە بێت یاخود کارێکی هەڵەوە یا جیاوازیتان لە بیرو بۆچووندا. بەشێوەیەکی راستو شیاو بنوارنە کارە باشەکان بەو جۆرە کاروبارەکان بەرەو رەزامەندی هەردوولا بەڕێوە دەچێت.

بۆیە زۆر زەحمەتە بەلای پیاوانەوە کاتێك دەگەرێنەوە بۆ ماڵەوە خێزانەکانیان پێشوازیان لێ بکەن بە سکالاکردنو بۆڵەبۆڵ کردن، بۆیە هەمیشە پیاوان ئەم نامەیە ئاراستەی خێزانەکانیان دەکەن:

((بەیارمەتی خۆتان ئەی خێزانە ئازیزەکەم، ئێمەی پیاوان بەراستی ئێوەمان خۆش دەوێت، هەرچەندە ئێوە واگومان دەبەن کەناتوانین یارمەتیتان بدەین لە حاجەت شۆردنو چێشت لێناندا، بەڵام لە راستیدا ئێمە هەڵدەستین بەجێبەجێکردنی قورسترین کار لەپێناوی ئێوەدا، هەروەك دەزانن بەیانیان زۆر زوو هەڵدەستین لە رۆژانی سەرماو بەفردا بە قاچەکانمان سەهۆڵەکان دەشکێنینو ئارەقەتی نێوچاوانمان دەسرین، بزانن گەرماو سەرما دەچێژین لە پێناو خۆشبەختی ئێوەدا، تەنانەت ئێمە ئامادەین بە ناو ئاگردا بڕۆین لە پێناوتاندا، چونکە خۆشمان دەوێن).

# پێگەی زەمەن لە ئامانجەکانماندا؟




لەم گەردوونەدا هەمووشتێك لەسەر زەمەن وەستاوەو دەروات، ئێمەش بەشێکین لەم گەردوونە کاتێکی دیاری کراومان پێبەخشراوە، تەواوی رەفتارو کردارمان لە چوارچێوەی زەمەندا گوزەر دەکەنو هەریەکەمان بەجۆرێك کاتەکانمان بەسەر دەبەین.

بەوردبوونەوەو بە سەیرکردنێکی رێبوار ئاسا لە ژیانی خۆمانو خەڵکانی دەوروبەرمان ئەوەندە بەسە کە دەبینین سەراپا ژیانمان پرییەتی لە بەفیڕۆدانی کاتو بەربڵاوی بیرکردنەوەو نەبوونی ئامانجی روونو ئاشکراو بەردەوام نەبوون لەسەر کار. بۆیە هەر لەم چرکە ساتەدا دەتوانیت هەڵوێستەیەك بکەیتو هەنگاوێك بەرەو دوواوە بگەڕێیتەوەو لە رابوردوی خۆت رابمێنیت، بزانیت بەرهەمی کاتی رابوردوت چییەو چەندە؟ بێگومان لەوانەیە رازی نەبیت لەو بەرهەمو ئەدای کارەت ئەویش تەنها لەبەر بەڕێوەبردنی کاتەکانتە بەو مانایەی نەمان توانیوە سوودی تەواو لە کاتەکانمان وەرگرین. کەواتە ئێستا پێویستیمان بەریزبەندییەکی سەر لە نوێ هەیە بۆ کارو کاتەکانمان بەرنامە رێژیەکی سەر لە نوێ بکەین. هەنگاوی هەرە گرنگو بنچینەیی بۆ ئەم کارەمان کە زۆر پێویستە دەستی پێ بکەین بریتییە لە دیاریکردنی شتە لە پێشەکان (اولویات).

چییە ئەو شتەی لای تۆ زۆر گرنگە؟ چییە ئەو شتەی کە تۆ باوەڕت پێیەتی؟ شایانی بەخشینی کاتو ماندوو بوونە. لە کاتێکدا کە ئەم پرسیارە لە زۆربەی خەڵك دەکەیت، یەکسەر وەڵامت دەدەنەوەو دەڵێن: ئایین، بیرو باوەڕ، پەروەردەی خێزانی، کارەکەم...هتد، بەڵام لە رێرەوی ژیانی بەرجەستەیان ئەمە بەدیار ناکەوێت.

دەتەوێت بزانیت لە ژیانت چ شتێك گرنگە؟ چ شتێك شایانی بەخشینە لە روانگەی بیروباوەڕی تۆوە؟ سەیری کاتەکانت بکە چۆن هەموو رۆژێك بەسەری دەبەیت، چۆن کارێك لەپێش کارێك ئەنجام دەدەیت لە خشتەی کارەکانتدا.

وەڵامی ئەم پرسیارانەت یارمەتی دەرێکی باشن بۆ دیاریکردنی نرخو بەهای کارە گرنگەکانت، بەڵام بەداخەوە زۆر لە کارەکانمان دژ بەیەکن لە کاتی دەرکەوتنی ئەم جیاوازییە زۆرەی لە نێوان ئەوەی باوەڕمان پێیەتیو لە پێشەوەی کارەکانمانن لەگەڵ ئەوەی لە ژیانی بەرجەستەیی کە ئەنجامی ئەدەین.

هانگاوێکی کردەیی: هەرئێستا کاغەزێكو پێنوسێك ئامادە بکە ئەمانە رێکبخە بەپێی گرنگیانو لەپێشەوە بوونی کارەکان لە روانگەی بۆچوونی خۆتەوە: (پەرستنەکان، کارکردن، بەردەوام بوون، دایك باوكو منداڵو خێزان، تەندروستی). ئینجا سەیر بکە لە جیاوازییەکان بۆ نموونە کەسی وا هەیە بەردەام بوون (الاستقامە) لە پێش کارکردن دادەنێت، هەیانە کارکردن لە پێشەوەی بەردەوامی دادەنێت، بێگومان ئەم جیاوازیانە تەواوی رێرەوی ژیان دەگۆڕن، یەکەمیان ئامادەیە لە پێناوی بەردەوامی کارەکەی ببەخشێ، لە کاتێکدا ئەوەی تریان لە پێناوی کارەکەی بەردەوامی دەبەخشێ. دوای تەواو بوون لە ریزبەندیو رێکخستی کارەکانت، بێگومان تۆ کاتەکانت بەوشێوەیە بەڕێوە دەبەیت کە گونجاون لە گەڵ ریزبەندی کاری لە پێشینەی خۆت، دەردەکەوێت لەزۆربەی کاتدا کە تۆ پێویستت بەوە هەیە کە سەر لەنوێ نەخشەی کاری رۆژانەت دابرێژیتەوە.

کەواتە ئێستا پێویستە ئامانجەکانت دیاری بکەیت، ئەو شتە دیاری بکە کە دەتەوێت بەدەستی بێنیت؟ بیر بکەرەوە کەوا تۆ ژیانی خۆت دەنووسیتەوە دوای بیست ساڵ؟ یان سی ساڵی تر؟ چی لە ژیانی خۆت دەگێریتەوە؟ ئەو وتانە بنووسە کە دوای مردنی تۆ هاورێکانو ئەندامانی خێزانەکەت لە رۆژی مردندا دەیکەن، پاش تەمەنێکی درێژ، سەیرکە بزانە چیت دەوێت لەوان کە لە سەر تۆبیلێن؟

بێگومان دیاریکردنی ئامانجو دانانی لەسەر بنچینەی شتەکان بە دوو جار دروست دەبنو لەدایك دەبن:

یەکەمیان: دارشتنی ئامانجەکان لە مێشکماندا ئەویش لەرێگای دروستکردنی وێنەیەکی روونو ئاشکرا لە بۆ هەموو ئەو شتانەی دەمانەوێت بە دەستی بێنین یان پێیان بگەین، هەریەك لەم وێنانە وەرگرە دوای ساڵێکی تر یان پێنج ساڵی تر یان دە ساڵی تر کە تۆ پێی دەگەیت.

دووەمیان: پیادەکردنی لەسەر ژیانی بەرجەستەیی ئەویش لە رێگای کارکردنی بەردەوامو لێبڕاوانە بەرەو ئامانجی دیاریکراو، رێك وەکو ئەو ئەندازیارەی کە نەخشەیەکی تەواوی خانوویەکی لەبەر دەستدایە کە دەیەوێت دروستی بکات یەك بزمار داناکوتێ پێش ئەم نەخشەیە. بیهێنە پێش چاوی خۆت چەندین کەس کە هیچیان کەم نییە لە زیرەکیو هەستیاریو کارکردنی لێبڕاوانە، بەڵام بیرو هۆشیان پەرتوبڵاوە بە هۆی نەبوونی ئامانجی دیاریکراو، لە یەکێك لە زانکۆکانی ئەمریکادا تاقیکردنەوەیەك لەسەر (١٠٠) قوتابی ئەنجامدرا کە خوێندنیان تەواوکردبوو، داوایان لێکرا کە هەریەکەیان لەسەر کاغەزێك ئەو ئامانجە دیاری بکات کە دەیەوێت لە ژیانی پێی بگات لەگەڵ نووسینی ناونیشانی تەواوی قوتابیەکان، لەگەڵ ناوو ژمارەی تەلەفۆنەکانیان، هەموویان ئامانجیان دەوڵەمەندی بوو، دوای (١٠) ساڵ، بەڵێ دەساڵ پەیوەندیان بە قوتابیەکانەوە کردەوە، سەیریان کرد داهاتیان چەندین ملیۆن دۆلاربوو لەم سەد قوتابیە (١٠) قوتابیان ئامانجەکەیان بە روونی نووسی بوو کە چۆن بگەن بە دەوڵەمەندییەکە، جۆری کۆمپانیاو قۆناغەکانی کارو نەخشەکەیان بە وردی دیاریکردبوو، بەڵام (٩٠) قوتابیەکەی تر تەنها ئامانجیان دەوڵەمەندی بوو بەبێ دیاریکردنی ئامانجی روونو ئاشکرا، هەر بۆیە رێژەی تەنها ٤٪ی داهاتەکە چەندین ملیۆن دۆلار بوو بەر ئەم (٩٠) قوتابیە کەوتو رێژەی ٩٦٪ داهاتەکەی تریش کە چەندین ملیار دۆلاربوو بەر (١٠) قوتابیەکە کەوت.

# هونەری دەربڕین و کاریگەری وشە جوانەکان

هەمزە عەباس فەقێ

بێگومان مرۆڤەکان لە پێناو دەرکەوتنیان بە جوانترین شێوە، هەردەم لە خەمی هەڵبژاردنی پۆشتە ترین جل‌وبەرگ‌و پۆشاك‌و پێڵاودان، بە جۆرێك هەوڵ دەدەن هەماهەنگی رەچاو بکەن لە نێوان ئەو جلانەی کە دەیپۆشن، تەنانەت رەنگی بۆینباخ لە کۆت‌و شەرواڵ‌و پشتێنیش لە جلی کوردیدا بەهەند وەرگیراون، هەموو ئەمانە بۆ خاتری سەلماندنی کەسایەتییەکی هاوسەنگ‌و رێز لێگیراوە، بەڵام لەوانە گرنگتر هەڵبژاردنی وشە جوان‌و شیرینەکانە، لە پێناو دروستکردنی جوانترین رستە‌و دەربڕینی بە رووی بەرامبەردا، دروستکردنی جوانترین رستە‌و دەربڕینی بە ئارامی‌و شکۆوە نەك هەر تەنها کاریگەرە، بەڵکو باشترین پێوەرە بۆ دەرخستنی هێز‌و توانای هونەری‌و ژیری‌و بیرکردنەوەت‌و سەلماندنی کەسایەتییەکی بەهێز‌و رێز لێگیراو، بۆ ئەو مەبەستە سوود لەم کورتە چیرۆکە وەردەگرین:

پادشایەك شەو لە خەونیدا هەموو ددانەکانی دەکەون، کەوتنی ددان لە خەودا لە کۆن‌و ئێستادا وا لێك دراوەتەوە کە مانای مردن‌و لە دەست دانی خزم‌و کەس دەگەیەنێت، بۆیە پادشا بەدوای هەموو ئەوانەدا دەنێرێت کە لە بواری شرۆڤەی خەوندا شارەزان، بەڵێنیش دەدات هەرکەسێك بەشێوەیەکی جوان راڤەی ئەو خەونەی بۆ بکات خەڵاتێکی باشی پێدەبەخشێت، چەند کەسێك بۆ ئەو مەبەستە ئامادە دەبن، هەریەك بەنۆرەی خۆی دەچنە لای پادشاو لە راڤەی خەونەکەیدا دەڵێن: قوربان خەونەکەت مانای مردنی هەموو خزم‌و کەست دەگەیەنێت، سەرئەنجام پادشا بەم وەڵامە دڵ تەنگ‌و تورە دەبێت بڕیار دەدات هەموو راڤەکەرەکان بخرێنە زیندان.

دەنگۆی ئەم خەونە زیاتر بڵاو دەبێتەوە، تا رۆژێکیان کەسێکی ژیر دێتە کۆشکی پادشایی‌و دەڵێت: من راڤەی ئەو خەونە بۆ پادشا دەکەم، گەرچی پاسەوانەکان بە گوێچکەیا دەچرپێنن ئەگەر وەڵامی تۆش وەك ئەوانی ترە ئەوا زیندان دەبێتە جێگات، بەڵام پیاوەکە بە متمانە بەخۆ بوونەوە دەچێتە بەردەم پادشای خەمناك، کاتێك پادشا سەر هەڵ دەبڕێ‌و پێی دەڵێت: ها کابرا تۆش دەڵێیت خزم‌و کەسم هەموو دەمرن‌و منیش نەگبەت‌و بێ چارە دەبم؟ کابرا وتی نەخێر قوربان، پادشامان سەلامەت بێت، مانای ئەم خەونە ئەوەیە (پادشای پایەدارمان زۆرتر لە ژیاندا دەمێنێتەوەو تەمەنی بەرێزتان لە هەموو کەس‌و کارت درێژتر دەبێت)!

ئەویش بەم وەڵامە زۆر دڵخۆش دەبێت‌و کابراشی خەڵات کرد، لە کاتێکدا ئەم وەڵامەش هەمان ئەو وەڵامە بوو کە پێشتر بیستبووی، بەڵام بە دەربڕینێکی ژیرانە، ئیتر با لێکدانەوەمان بۆ رووداوو پێشهاتەکان پڕ بێ لە ئومێدو گەشبینی، بۆیە دەکرێ بە پشت بەستن بە هونەری بەکارهێنانی وشە جوانەکان خەڵاتی ژیان وەربگرین.

# بڕیاری دا لە پێش کەڵەشێرەکەوە لە خەو هەستێ



ئاوات جەمال

دەگێڕنەوە کابرایەکی داربڕ کەڵەشێرێکی هەبوو، هەموو بەیانییەك زوو کەڵەشێرەکە دەیخوێندو کابرای داربڕی لە خەو هەڵدەستاند.

ڕۆژێك داربڕەکە لەبەر خۆیەوە وتی: باشە بۆچی من خۆم هەوڵ نەدەم هەموو بەیانییەك خەبەرم بێتەوە، بۆ دەبێت هەر کەڵەشێرەکە خەبەرم کاتەوە، پەیمان بێت کارێك بکەم هەموو بەیانییەك لە پێش کەڵەشێرەکەوە خەبەرم بێتەوە.

بۆ جێبەجێکردنی پەیمانەکەی بڕیاریدا کە لەمەودوا ئێواران خواردن کەم بخوات و شەوان زوو بخەوێت، دوای ئەوە هەموو بەیانییەك کابرا زوو خەبەری دەبوویەوەو هەڵدەستا کەلوپەلەکەی کۆدەکردەوەو خۆی ئامادە دەکرد بۆ ڕۆیشتن، کەڵەشێرەکەش لە دەنگی هەڵسوکەوتی کابرا خەبەری دەبوویەوە، بۆیە کابرای داربڕ وتی: ئەگەر کەسێك بیەوێت کارێك بکات و لێبڕێ و هەوڵی جدی بۆ بدات دەتوانێت ئەنجامی بدات.

لەم چیرۆکەوە فێردەبین:

١- بۆ جێبەجێکردنی کارەکانی ڕۆژانەمان، پێویستە پشت بە خۆمان ببەستین.

٢- بڕیاردان بۆ کردنی هەر کارێك پێویستی بە هەوڵ و کۆشش هەیە.

٣- فێرمان دەکات کە بڕیاردان لە هیچ کارێکدا ئەستەم نییە.

ن: دارەوان

# کتێب خۆراکی مێشکە

ڕەنگە زۆربەمان ئەو وتەیەی سەرەوەمان بیستبێت، زۆریشمان بە وتەیەکی جوان و کاریگەرمان دانابێت. بەڕاستی کتێب خۆراکێکی پێویستە بۆ مێشك وەك چۆن جەستە پێویستی بە خۆراك هەیە بۆ گەشەکردن و بە هێز بوونی، ئاواش مێشك پێویستی بە خۆراکێکی تایبەتی هەیە بۆ گەشەکردن و بەهێزبوونی کە ئەوەش خوێندنەوەیە.

مرۆڤ لە هەر کات و سەردەمێك و لە هەر تەمەنێکدا بێت پێویستی بە خوێندنەوە دەبێت، بۆ ئەوەی لە دەوروبەری و لە ئەو شتانەی کە لە دەوروبەرێتی باشتر تێ بگات. ئێمە خۆمان دەبینین کە ئەو کەسانەی کە دەخوێننەوەو بایەخ بە خوێندنەوە دەدەن لە هەر کۆڕوو کۆبونەوەیەك و گفتوگۆیەکدا بن وتەکانیان کاریگەری دەبێ بۆ سەر کەسانی دەوروبەریان، لەبەرئەوەی وتەکانیان بە شێوەیەکی جوان و زانستی دەردەبڕن و هەمیشە لە وتەکانیاندا بەڵگەو نمونەی جوان و کاریگەر بە کاردەهێنن. بەڵام ئەمە بۆ کەسانێك کە بایەخ بە خوێندنەوە نادەن ئەستەمە، ئەوان وتەکانیان زۆر کاریگەری نابێ بۆ سەر کەسانی دەوروبەریان لە بەرئەوە ناتوانن وتەکانیان بە شێوەیەکی زانستی دەربڕن و بەڵگەو نمونە بە کاربهێنن. بۆ نموونە ئەگەر دوو کەس یەکیان بە بەردەوامی خۆراکی پێویست بە کاربێنێ دەبینین جەستەیەکی بەهێزی دەبێت، بەڵام ئەوی تریان نەتوانێ خۆراکی پێویست بە کاربێنێت دەبینین کە جەستەیەکی لاوازو بێهێزی دەبێت، ئەگەر هاتوو ئەو دوو کەسە لە یارییەکی زۆرانبازیدا بەرامبەر یەك یاری بکەن دەبینین ئەو کەسەی کە جەستەیەکی بە هێزی هەبوو واتە بە بەردەوامی خۆراکی پێویستی بە کاردەهێنا سەردەکەوێ، لەبەرئەوە بەرامبەرەکەی بە هۆی کەم خۆراکییەوە جەستەیەکی بێ هێزو لاوازی هەبوو. کتێبیش وایە هەتا زیاتر بخوێنیتەوە ئەوا مێشکت زیاتر بە هێز دەبێت و زیاتر گەشە دەکات و زیاتر دەتوانی سەرکەوتوو بیت لە ژیاندا. کتێب سەرچاوەیەکی سەرەکییە بۆ ڕۆشنبیربوونی هەموو کەسێك و دەتوانێت گۆڕانکاری لە هەموو کەسێکدا بکات. وەك وتراوە کتێب باشترین هاوڕێی مرۆڤە، کە دەتوانێ بۆ چارەسەرکردنی زۆربەی کێشەکانت پەنا بەریتە بەر کتێب لە هەموو بوارەکاندا وەك (ئاینی، دەرونزانی، زانستی، فیکری، فەلسەفە...... هتد).هەروەها کتێبیشە دەتوانێ گۆڕان لە دەوڵەتدا دروست بکات و بەرەو پێشکەوتنی ببات. وەك ئەو وتەیەی کە دەڵێت:

(ئەگەر ویستت مێژووی نەتەوەیەك بزانی سەیری مۆزەخانەکەی بکە)،
بەڵام ئەگەر ویستت داهاتووی بزانی سەیری کتێبخانەکەی بکە).

# بەرهەمی راستی

دەگێرنەوە لە کۆندا شازادەیەك ویستی کچێك هەڵبژێرێت و بیکاتە هاوسەری خۆی، بۆ ئەم مەبەستە بانگهێشتی کچانی مەملەکەتی کردو تا لە گۆرەپانێکی فراواندا سەیریان بکات و کەسێکیان بەخت یاوەری بێت و ببێتە هاوسەری شازادە. کچانی شار هەر یەك لە دڵی خۆیدا بە نیاز بوو شازادە هەڵی بژێرێت.

لەناو کچەکاندا کچێك بە رووخسار ناشیرین بوو. هەموو دەوروبەری پێیان دەگوت: هەرگیز شازادە تۆ هەڵنابژێرێت هەموو ئەو کچانە لە تۆ جوانترن، بەڵام کچەکە گوێی بە قسەکانیان نەدەدا، ئەویش بە هیوای ئەوەی شازادە هەڵیبژێرێت بریاری دا بچێتە گۆرەپان. کچەکان هەموو چوون بۆ ئەو گۆرەپانەی کە شازادە بە نیاز بوو تەماشایان بکات، پاشان شازادە هاتە ناو گۆرەپان و تەماشای هەموو کچەکانی کرد، دواتر هەریەکەو ئینجانەیەك گڵ و تۆوی گوڵی دایە دەستیان و وتی: ماوەیەکی دی لە هەمان شوێن کۆ دەبینەوە، ئێوەش ئەو تۆوانە بچێنن و بیهێنن، من تەماشایان دەکەم و بزانم کام گوڵیان زۆر جوانترە خاوەنی ئەو گوڵە دەکەم بە هاوسەری ژیانی خۆم.

هەموو دەستیان کرد بە چاندنی تۆوەکان، چەندین گوڵی جوان و سەرنج راکێش لە ناو ئینجانەی کچەکاندا رووا، تەنها ئەو کچەی کە پێیان دەگوت: ناشیرین چەندین جار ئەو تۆوەی دەچاند نەدەبووە گوڵ، کاتی گەرانەوەی شازادە هاتە پێشەوە، هەموو کچەکان بە ئینجانە پر گوڵەکانیان رۆیشتنە شوێنی مەبەست، دیسان وتیان: بەو کچە، شازادە هەرگیز تۆ هەڵنابژێرێت هەموو ئینجانەی کچەکانی دی گوڵی جوانی تێدایە، بەڵام ئینجانەی تۆ هیچی تێدا نییە، بەڵام کچەکە پێداگری کردو لەسەر چوون بۆ گۆرەپان سور بوو، هەمووچوونەوە بۆ گۆرەپان تا شازادە جوانترین گوڵ و سەرنج راکێشترینیان پەسەند بکات و خاوەنەکەی بکاتە هاوسەری ژیانی.

شازادە هاتە نێو گۆرەپانەکەو تەماشای ئینجانەی کچەکانی دەکرد هەموو گوڵی جوانی تێدایە، تەنها کچێك نەبێت! ئەوەی جێگەی سەرسورمانی هەمووان بوو ئەوەبوو شازادە ئەو کچەی هەڵبژاردو کردیە هاوسەری خۆی کە ئینجانەکەی هیچ گوڵێکی تێدا نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا رووخساری لە هەمووان ناشیرینتربوو! بە کچەکانی دیکەی گوت: ببورن ئێوە هیچ یەکێکتان راستگۆ نەبوون، چونکە ئەو تۆوانەی من پێشکەشتانم کرد هیچیان نەدەبوونە گوڵ و پوچ بوون!



شەهلا عومەر

# مافێکی سپی بۆ پەپولە تاقانەکەم

موئمین زەڵمی

(سپی بوونی مەرگ، تەنها بە سپی بوونی ژیان دەکرێ)

لێرە لە ناو ساباتی جوانییەکانی گوڵدا، لەوێ لە ناو هەناسەبارانی ژیاندا، تۆ تەنها قامەتی جوانییەکانی منی، پەپولە رەنگین سپیەکەم، کە باس دێتە سەرچاوانم، خەیاڵی گەورەیی ژیان دەنوسمەوە، هەنگاو دەنێم... پەنجەرەکانی ژیانیش لێك ئەنێم و چاوم دەکەمە پەنجەرە بۆ بینینی رووخساری نورینی جوانت... سپی رەنگم، سپی رەنگیت ئاوێزانە بە جوانترین نمەی ئەوین، ئاوێزانە بە جووتەوانەی خۆشەویستی و بارانی ژین... کە باس دێتە سەر باسی تۆ... ئیتر ناوت بۆ هەمیشە دەبێتە عەشق و مانای تۆ... تاقانەکەم، کە ماناکانی ژیان و بینینە جوانەکانی هزرت لە خۆم ئەچێ، وشەیەکی سپی رەنگی، لە ناو رستەی سپی ژیندا مانای سپی بەو هەناسانە ئەدەی کە چاوەرێی سپی بوونی رووخساری پیری خۆیانن، ئێوارەیەك کە قامەتی پیری خۆیان لە ئاوێنەکانی ژیاندا بە سپییەتی ئەدەنەوە... ماچی سپی ئەبارێنن... توند خۆیان توند توند ئەگوشن، بیر لە مێژووی سپی، ببورە رەشی خۆیان ئەکەنەوە، بە بیرت دێ کە ساوا بووی لەسەر تەختەی وێنەکێشان وێنەی ڤیلای گەنجێتی خۆتت ئەکێشا، وێنەی ئێستای خۆت ئەبینی و مانای ئێستای خۆت ئەکێشا... پەپولەکانی ڤێلاکەش سپی رەنگ بوون... هەموو شتەکانیش سپی، جگە لە دڵی چوارچرا.. ئەزانی بۆ؟ چونکە لە وێنەکەی ئێستایدا مانایەکی بۆ گەورەکان نەهێشتبۆوە، رێك وەك ئەوەی کە پیرەکان، مانایەکیان بۆ پیرەکانی پێش خۆیان نەهێشتبۆوە.. پەپولەکەم، تۆش ئەتەوێ بۆ تەمەنت، هەر سپی بی، ئەگەر وایە سپی بژی، تا ئەوکاتە سپی ئەمری...



# پاسایەکی سەیر بۆ هەڵبژاردن

و: محمد عەولا مێرگەیی - چۆمان

دەگێرنەوە زوو لە یەکێك لە شارەکان شێوازی دیاریکردنی پاشاکانیان شێوازیکی زۆر سەیر بوو، ئەویش ئەوە بوو هەر پێنج ساڵ کەسێکی شیاویان دەست نیشان دەکرد کە ببێ بە پاشایان تا ئەوساڵە تەواو دەبوو، پاشان بەشێوازێکی ڕێکوپێك بەڕێیان دەکرد بۆ دوورگەیەك بۆئەوەی ئەوەندەی لە ژیاندا ماوە لەوێ بەسەری ببات، بە پێی ئەو یاسایە پاشا مافی گەڕانەوەی بۆ شار نەبوو، ئەوەبوو کاتێك کە حوکمی یەکێك لە پاشاکان تەواو بوو زۆر بەڕێزەوە هێنایان جلو بەرگێکی قەشەنگیان لە بەرکردو بردیان لە ناو تەواوی شاردا گێرایانو ماڵئاوای لە خەڵکەکە کردو دواتر سواری کەشتیان کردو بردیان بۆ دوورگەکە، لە گەڕانەوەیان تووشی کەشتییەکی تێکشکاو بوونو بینیان لە نزیکی کەشتییەکە گەنجێك بە یەکێك لە پارچە دارەکانی کەشتییەکە خۆی گرتۆتەوە، کاتێك چاوی بە خەڵکەکە کەوت داوای یارمەتی لێکردنو ئەوانیش ڕزگاریان کردو هێنایانەوە بۆ شارەکەیان، بینیان کەوا کەسێکی لێهاتوو بە تواناو شیاوو گونجاوە بۆ پاشایەتی، لەبەرئەوە داوایان لێکرد کە ببێت بە پاشایانو سەرجەم مەرجەکانی پاشایەتیشیان بۆ ڕوونکردەوە، ئەویش ڕازی بوو بەو مەرجەی سەردانێکی ئەو دوورگەیە بکات کە دوای تەواو بوونی دەسەڵاتەکەی بۆی ڕەوانە دەکرێت، ئەوانیش ڕازی بوون بە مەرجەکەیو ئەوەبوو هەر لەگەڵ وەرگرتنی دەسەڵاتەکەی، سەردانێکی دوورگەکەی کرد، بینی دوورگەکە پڕە لە دڕندەو جەنگەڵستانێکی هەزار بەهەزاری خاڵی لە هەموو خزمەتگوزارییەك! لە هەمووی ترسناکتر ئەوەبوو کە لاشەی ئەو پاشایانەی پێش خۆی تەنیا ئێسقانیان مابوو! هەموویان ببوون بە خۆراکی دڕندەکان ئیتر گەڕایەوەو فەرمانی دا بە پێکهێنانی تیمێکی بە توانا لە کرێکارو جوتیاری شارەزا، بۆ ئەوەی بەر لە هەموو شتێك بچن ئەو دارو جەنگەڵە زیادەی کە هەیە لە دوورگەکە ببڕنو ڕاوی ئەو دڕندانە بکەن کە لە دوورگەکە بوون، پاشان بۆ ساڵی دووەمی دەسەڵاتی فەرمانی دا کە چەند باخچەیەکی جوانو قەشەنگ لە دوورگەکە دروست بکەنو چەند ئاژەڵێکی ماڵی ببەن بۆ دوورگەکەو دواتر لە ساڵی سێیەمو چوارەم فەرمانی دا بە دروست کردنی چەند کۆشکێکی جوانو قەشەنگ لە دوورگەکە، تا وای لێهات کردیان بە شوێنێکی زۆر خۆشو پڕ ئارامو دوور لە هەموو مەترسییەك، بۆیە کاتێك کە پاشا ماوەی دەسەڵاتی تەواو بوو دەستو پێوەندەکانی هەڵسان بە گرتنە بەری ڕێوشوێنی پێویست بۆ ماڵئاوای کردن لە پاشا، سەرەتا جلێکی تایبەتیان کردە بەر پاشاکەیانو پاشان گێرایان بە تەواوی شاردا، بەڵام ئەوەی جێی سەرنجی خەڵکەکە بوو ئەوەبوو پاشا بە دڵێکی خۆشو بەزەردەخەنە ماڵئاوایی لە خەڵکەکە دەکرد، جیا لە پاشاکانی پێش خۆی کە هەموویان بە شیوەنو گریان ماڵئاواییان لە خەڵکەکە دەکرد، بۆیە کەپرسیاریان لە پاشا کرد دەربارەی ئەو زەردەخەنەو دڵخۆشییەی؟ لە وەڵامدا وتی: من دڵنیا بووم لەوەی کە بمەوێو نەمەوێ هەر ڕەوانەی ئەو دوورگەیەم دەکەن، بۆیە منیش لە ماوەی دەسەڵاتمدا بەشێك لە کاتم تەرخان کرد بۆ ئەوەی کارێکی وا بکەم کە کاتێ ڕەوانەی ئەم دوورگەیەم دەکەن باقی ژیانم لەوێ بە ئارامی بەسەر بەرم جیاواز لە پاشاو دەسەڵاتدارانی پێش خۆم، کە ئەوانیش وەك من دەیانزانی ڕۆژێك دێ دەسەڵاتیان کۆتایی دێت! بەڵام لە بەر ڕابواردنو لە خۆبایی بوون لەو ماوەیەدا هیچ ئاوڕێکیان لە چارەنووسی خۆیان نەدایەوەو بوون بە خۆراکی دڕندەکانی دوورگەکە! بەڵام من ئێستا دەتوانم ئەو ژیانەی ماومە لەوێ زۆر بەخۆشی بەسەری بەرم.

کەواتە خۆشەویستان ئێمەی مرۆڤیش وەك ئەو پیاوە ژیرە هەموومان دەزانین کە چارەنووسمان بۆ کوێ دەڕوا! ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە دەستی ئاوەدانی درێژبکەین بۆ ئەو چارەنووسەمان، بۆ ئەوەی لە کاتی ماڵئاوایی یەکجاریماندا بە زەردەخەنەو خۆشحاڵیو دڵنیاییەوە سەربنێینەوە؟؟

سەرچاوە/
ئینتەرنێت سایتی (maharaty.com)

# دایك و منداڵ

و: دەرناخ رەئوف

لــە تەمەنی یەك ســاڵیدا بەدەســتی خۆی پەروەردەی کردیتو رۆژانە چەندجار خاوێنی دەکردیتــەوە، تــۆش بــە گریانو شــەونخونی سوپاست کرد.

لــە تەمەنی دوو ســاڵیدا تۆی فێری قســە کردنو پێگرتن کرد، تۆش بە راکردن لەم ژوور بۆ ئەو ژوور سوپاست کرد.

لە تەمەنی سێ ساڵیدا خۆشترینو بەتامترین خواردنی بۆ ئامادە کردی، تۆش بە رشتنی قاپە خواردنەکەو زۆرجار شکاندنی قاپەکان سوپاست کرد.

لە تەمەنی چوارســاڵیدا تۆی فێری گرتنی پێنووســە رەنگــاو رەنگــەکان کــرد، تۆش بە کێشــانی وێنەی جۆراو جۆر لەسەر دیوارەکاندا سوپاست کرد.

لە تەمەنی پێنج ساڵیدا تۆی بە دڵ گیرترین جلوبــەرگ رازاندەوە، تۆش بــە دیتنی یەکەم چاڵــە قــورو چونە نــاویو یاریکــردن تیایدا سوپاست کرد.

لــە تەمەنــی شــەش ســاڵیدا هەتاوەکــو بــەردەم قوتابخانــە لەگەڵت دەهــات، تۆش بە قیژاندنو گریان لەســەر شــەقامەکەو گوتنی «ناچچچچچچچم» سوپاست کرد.

لەتەمەنی حەوت ساڵیدا تۆپێکی بە دیاری بۆ کریت، تۆش بە شکاندنی شوشەی پەنجەرەی ماڵی دراوسێکەتان سوپاست کرد.

لەتەمەنی نۆ ســاڵیدا تۆی خستە خولێکی فێربوونەوە، تۆش بەنەکردنی کۆشش (سەعی) تەنانەت بۆ یەك رۆژیش بێت سوپاست کرد.

لە تەمەنی یانزە ســاڵیدا تــۆو هاورێکانتی بــرد بۆ ســینەما، تۆش بە گوتنــی» تۆ لەگەڵ ئێمەدا دامەنیشە» سوپاست کرد.

لە تەمەنی دوانزە ســاڵیدا نەیدەویســتو رێگری لێ دەکردیت بۆ تەماشاکردنی بەرنامەو کەناڵە زیان بەخشــەکان، تــۆش کاتێك لە ماڵ نەدەبوو بە سەیرکردنی گشتیان سوپاست کرد.

لە تەمەنی پانزە ســاڵیدا لە کاتی پشــووی هاوینــدا تۆی نــارد بۆ ماڵی باپــیرت، تۆش بە نەناردنی تەنها نامەیەکیش سوپاست کرد.

لە تەمەنی حەڤدە ســاڵیدا رێگەی پێدایت لەگــەڵ هاورێکانتــدا بچیت بۆ ســەیران، تۆش بە نەکردنی تەنانەت تەلەفۆنێکیش سوپاســت کرد.

لە تەمەنی بیســتو یەك ســاڵیدا بیرۆکەی باشی پێدەبەخشــیت بۆ کارو پیشەت، تۆش بە گوتنی «من وەك تۆ نابم» سوپاست کرد.

لە تەمەنی بیستو دوو ساڵیدا کاتێك جلی جوانــت لەبــەر کردو خۆت کەشــخە کــرد، لە ئامێزی گرتیتو شــانازی پێوەکردیت، تۆش بە داواکردنــی پارەیەکی زۆر بۆ ســەفەر کردن بۆ ئەوروپا سوپاست کرد.

لە تەمەنی بیســتو چــوار ســاڵیدا داوای لێکردی ژن بهێنیتو منداڵەکانت ببینێت، تۆش بــە گوتنی «من خۆم کاتــی ژن هێنان دەزانم» پێچەوانەییــت لەگەڵــدا کــردو بەم شــێوەیە سوپاست کرد.

لە تەمەنی بیســتو پێنج ساڵیدا بریارت دا کە خێزان پێکەوە بنێیت، دایکیشت زۆر دڵخۆش بوو، تۆش بە درەنگ ســەردانکردنی سوپاســت کرد.

لە تەمەنی ســی ســاڵیدا کاتێك منداڵێکتان پێ بەخشرا، چۆنیەتی منداڵ بەخێوکردنی پێ گوتی، تۆش بە گوتنی «ئەم شێوە بەخێو کردنە هی زەمانی پێشــووە، وازمان لێبهێنە» سوپاست کرد.

لە تەمەنی چل ســاڵیدا پێی گوتیت «کورم بــا پێکەوە بچین بۆ ســەردانی ماڵی فلان خزم نەخۆشــە» تۆش بە گوتنی لە کۆڵم بەرەوە تۆ بەم پیرییەوە بۆ کوێ دەچیت سوپاست کرد.

لە تەمەنی پەنجا ساڵیدا دایکت زۆر نەخۆش بوو، لە کۆتایی هەفتەدا بە سەردانەکەی تۆ زۆر دڵخــۆش بوو، تۆش بە گوتنــی ئەم پیرانە وەك منداڵ نــازو مەکر دەکەن، دەنــا هیچیان نییە سوپاست کرد.

رۆژێــك دێــت.... دایکــت کۆچــی دوایــی کــردووەو بۆ دواجــار ماڵئاوایی لــێ کردویت، دوای ئــەوەی کە هیچت نەکرد بــۆ دایکت لەم دونیایەدا، ئازارێك وەك هەورە بروسکە دەدا لە دڵتو پێــت دەڵێت «ئەی ســپڵەی بێ وەفا بەم شێوەیە رێزی دایك دەگیرێت».

سەرچاوە/ ئینتەرنێت

# بانگێشەکردن

وەرگێڕانی لەئینگلیزیەوە محمد موسى ابراهيم

ئافرەتێك لە خانوەكەی هاتە دەرەوەو سێ پیرە پیاوی ردێن سپی بینی لەبەردەم باخچەی پێشەوەی ماڵەكەیدا دانیشتبوون، ئافرەتەكە ئەوانی نەدەناسیەوە.

وتی: «واهەست ناكەم ئێوە بناسم، بەڵام لەوانەیە برسیتان بێت.

تكایە وەرەنە ژوورەوەو شتێك بخۆن.»

پرسیان: «ئایا خاوەن ماڵ لە ماڵەوەیە؟»

وتی: «نەخێر، لە دەرەوەیە»

وەڵامیان دایەوە: «جا ناتوانین بێینە ژوورەوە.»

كاتێك هاوسەرەكەی ئێواری گەرایەوە ماڵەوە، رووداوی سێ پیاوەكەی بۆ گێرایەوە.

وتی: «برۆ پێیان بڵێ لە ماڵەوەمو بۆ ژوورەوە بانگێشتیان بكە!»

ئافرەتەكە چووە دەرەوەو پیاوەكانی بانگێشت كرد.

وەڵامیان دایەوە: «ئێمە بەیەكەوە ناچینە ناو ماڵێكەوە.»

ویستی بزانێ: «ئەوە لەبەرچی؟»

یەكێك لە پیاوە پیرەكان روونی كردەوە: «ئەوە ناوی (سامان)ە لەو كاتەدا ئاماژەی بۆ یەكێك لە هاورێكانی كرد، ئاماژەی بۆ ئەوەی تر یش كردو وتی: «ئەوە (سەركەوتن)ە و منیش (خۆشەویستی)م.» پاشان زیاتر روونی كردەوەو وتی: «ئێستا برۆ ژوورەوەو گفتوگۆ لەگەڵ هاوسەرەكەت بكەو بزانە حەز دەكەن كام لە ئێمە بێینە ژوورەوە؟»

ئافرەتەكە چووە ژوورەوەو ئەوەی بە هاوسەرەكەی راگەیاند كە پێی وترابوو.

هاوسەرەكەی زۆر دڵ خۆش بوو.

وتی: «چەندە خۆشە!!! مادام وایە، با سامان بانگێشت بكەین.

بابێتو ماڵمان پڕ بكات لە سەروەتو (سامان)».

خێزانەكەی رازی نەبوو و وتی: «ئازیزەكەم بۆچی (سەركەوتن) بانگێشت نەكەین؟»

بووكەكەیان لە سوچەكەی تری خانووەكە گوێی گرتبوو.

بە پێشنیاری خۆی هاتە ناو بابەتەكەوەو وتی: «ئایا باشتر نییە (خۆشەویستی) بانگێشت بكەین؟

ماڵەكەمان پڕ دەبێت لە خۆشەویستی!»

هاوسەرەكەی بە خێزانەكەی وت: «با بەقسەی ئامۆژگاری بووكەكەمان بكەین، برۆ دەرەوەو با خۆشەویستی بانگێشت بكەین تا بێت بە میوانمان.»

ئافرتەكە چووە دەرەوەو لە سێ پیرە پیاوەكانی پرسی: «كامتان خۆشەویستییە؟ تكایە وەرە ژوەرەوەو ببە بە میوانمان.»

(خۆشەویستی) هەڵسایە سەرپێو بەرەو خانووەكە دەستی بە رۆیشتن كرد.

دووەكەی تریش هەڵسانە سەرپێو بەدوای هاتن.

ئافرەتەكە بە سەرسورمانەوە لە (سامان)و (سەركەوتن)ی پرسی: «تەنها بانگێشتی (خۆشەویست)م كرد، باشە، ئەی ئێوە لەبەرچی دێنە ژوورەوە؟»

پیاوە پیرەكان بەیەكەوە وەڵامیان دایەوە: «ئەگەر تۆ (سامان) یان (سەركەوتن)ت بانگێشت بكردایە، هەردووكمان لە دەرەوە دەماینەوە، بەڵام چونكە تۆ (خۆشەویست)یت بانگێشت كرد، بۆ هەر شوێنێ بچێت ئێمەش لەگەڵی دەچین.

لە هەر شوینێ (خۆسەویست)ی لێبێت، (سامان) و (سەركەوتن) یشی لێ یە!!!»

نووسەری ئەم چیرۆكە نەناسراوە.

سەرچاوە: ئینتەرنێت

# وانەی سەرۆك

ئازاد محی الدین/ خورماڵ

دەگێرنەوە سەرۆكی وڵاتێك لە شەقامی شار تێپەڕ بوو كاتێك وێنەیەكی خۆی بە گەورەكراوی لە دووكانێكدا كەوتە بەرچاوی دووكان، دووكانی نانەوا خانە چوو سڵاوی كرد زۆر هێمنانە داوای مۆڵەتی چوونە ژووری كرد خاوەن نانەوا داوای قبوڵ كرد سەرۆك بە كردار هەستا لە پێشا نموونەی گونكەی هەویری كێشا دەركەوت گونكەكان كەسرو نوقسانن كێشی یاسایی چاك پێ ناسانن وتی ئەم وێنە بچووك كەرەوە كێشی گونكەكان زیاد بكەرەوە نە خەڵاتی كرد، بۆ وێنەی گەورەی نە سزای دانا بۆ گونكەو كولێرەی دەبا منو تۆ چاو لە وانە كەین نەك چۆنمان بوێ وا پێوانە كەین با گورگ نەبین لە پێستی مەڕا با مەڕیش نەبین لە گورگە شەڕا



# تەنانەت کوخەکەش سوتا!

و/ سایە فارس

ڕەشـەبایەکی تونـدو بەهێز لـە پانتایی دەریادا هەڵیکردە سەر کەشتییەك و نوقمی کرد، هەندێ لەسەر نشینەکان ڕزگاریان بوو، یەکێك لەوانە پیاوێـك بوو کە شـەپۆلەکانی دەریاکە گەیاندیانە کەنار دوورگەیەکی چۆڵ و نەناسراو، کاتێ پیاوەکە هاتەوە هۆش خۆی و هەستایەوەو کەوتە سـەر ئەژنۆکانی و سـەیری دەوروبەری خۆی کرد کەسی بەدی نەکرد، بارودۆخەکە زۆر دژوار بوو، دوورگەیەکـی چۆڵ، دەنگی بە هیچ کەس نەدەگەیشـت جگە لـە پەروەردگار، هەر بۆیە دەستەکانی ڕووەو ئاسـمان بەرزکردەوەو داوای یارمەتـی لـە خـوای گەورە کـرد تا لەو بارودۆخە دژوارە ڕزگاری بکات.

چەنـد ڕۆژێ تێپەڕی، ئەم پیاوە بە تەنها لـەو دوورگەیە مایـەوە، خواردنـی تەنها لە بەروبومـی ئـەو درەختە خۆرسـکانەبوو کە لـە دوورگەکەدا هەبوون، ئـاوی خواردنەوەی لە جۆگەیەکی نزیـك دوورگەکە دەخواردەوە، کوخێکـی لە لقـی درەختەکان دروسـت کرد، بۆ حەوانەوەو پاراسـتنی لە سـەرمای شەوو گەرمای ڕۆژ. ڕۆژێك خواردنی خسـتە سـەر ئاگرەکەو چاوەڕوانـی دەکرد تا پێ بگات، لەم کاتەدا کەمێك دوورکەوتەوە لە کوخەکەو بەناو دوورگەکەدا دەگـەڕا، لە ناکاو بینی دوکەڵ لە کوخەکـەوە بەرز بۆوە، بە هەڵـەداوان بەرەو ڕووی کوخەکە ڕۆیشـت، بەڵام تا گەیشـتەوە کوخەکە بە تەواوی سوتا بوو...

زۆر نیگەران بوو، هاواری دەکردو دەیگوت: خودایە گیان... تەنانەت کوخەکەشـم سوتا... هیچم بۆ نەماوەتەوە لەم دونیایەدا، من نامۆم لەم شـوێنەداو هاوارم بە هیچ شوێنێك ناگات جگە لە دەرگای بەزەیی تۆ!!

پیاوەکـە بـە دەم خـەمو خەفـەتو نیگەرانـیو برسـێتییەوە خەوی لـێ کەوت، بەڵام لە ناکاو ڕووداوێکی سـەیرو چاوەڕوان نەکراو ڕوویدا، ڕووداوێك کە هەرگیز چاوەڕێی نەدەکرد.... ئەویش بینی کەشـتییەك بەرەو دوورگەکە ڕێرەوی گرتووەو تا دێت زێتر نزیك دەبێتەوە، لە دڵـی خۆیدا دەیگوت تۆ بڵێی بۆ ڕزگار کردنی من هاتبن؟ کاتێك کەشـتییەکە گەیشـتە دوورگەکە، کابرا زۆر شـادمان بوو، خۆشـی سـەرتاپای گیانی داگرت، خۆشییەك کە نەیدەزانی چۆن گوزارشی لێ بکات! کاتێك پیاوەکە چووە نێو کەشتییەکەوە لێی پرسین: چۆن زانیتان من لەم شـوێنەدام؟ لە وەڵامدا وتیان: دووکەڵێکمان بینی، زانیمان کە کەسێك لەو جێگەیەدا هەیەو داوای یارمەتی دەکات!!!

بـە وردبوونەوەوەمان لەم بەسـەرهاتە زۆر شـتمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە پێشتر درکمان پێ نەکردووە، یاسـایەکی گەورە لە ژیانماندا هەیە، ئەویش ئەوەیە کە هەندێ جار ئێمە بە ڕووداوێك نیگەرانین، بەڵام لە ڕاستیدا خێری تێدایە.

لەسەر هەمووان پێویستە کە کاتێك تووشی نارەحەتـی یـان ڕووداوێکـی ناخـۆش دەبین نەهێڵـین ببێتە مایـەی بێ هیوایـیو گازەندە کردن، زۆر جار ڕوویداوە کە بەهۆی ڕووداو یان کارەساتێکەوە زۆر دڵ تەنگ بووینو گەشتوینەتە ئەو پەڕی بـێ هیوایی وەك بڵێـی ئیتر هەموو دەروازەکانمان لێ داخراوە، بەڵام پاش ماوەیەك بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە ئەو کارەساتە تەنها بۆ کردنەوەی دەروازەی کارێك یان خۆشییەك بووە کە هەرگیز بیرمان لێنەکردۆتەوە.

مرۆڤـی ژیـرو هۆشـیار تەنها سـەیری یـەك دیوی ڕووداوەکان ناکات، بەڵکو هەسـت دەکات لە پشت هەر کارێکەوە چەندین نهێنی هەیە! بـۆ نموونە لەنـاو خواردنێکی بەتامو ڕازاوەدا لەوانەیـە ماددەیەکی زیان بەخشـی تێدابێـت، بـە زیاتر خواردنیشـی کاریگەری خراپـی ماددەکە زیاتر دەبێـت، واتە با تەنها بـۆ ڕووکاری دەرەوە هەنگـاو نەنێـین تـا لە پاکیو دروسـتی ناوەڕۆکەکەشی دڵنیا دەبین، یان بـە پێچەوانەوە لەکاتێکـدا دەرمانێك بۆ چارەسەری نەخۆشـی بەکاردەهێنین، دڵنیاین لەوەی کە تامـی ناخۆشو تاڵە بەڵام بێگومان هۆیەکە بۆ چاك بوونەوەمان!

کەواتـە با هەموو فێر بینو تێبگەین لەوەی کاتێـك دەرگایەکمان لـێ دادەخرێـت دڵنیابین لەوەی کە دەرگایەکی ترمان بە ڕوودا دەکرێتەوەو بـێ هیوا نەبـینو نائومێدی ڕوومـان تێنەکات، ئاوابوونـی ڕۆژی پرشـنگدار هەڵهاتنـی مانگی بەدواوەیە بۆ ڕووناککردنەوەی شەوی تاریك.

بەهیوای ئەوەی کە هەموو کات لە لوتکەی هیواو گەشـبینیدا بـینو بەرگی ڕەش بینیو نائومێدی بدڕێنینو دڵنیا بین لەوەی لە دوای هەمـوو ناخۆشـیو نارەحەتییەك خۆشـیو ئاسوودەیی ڕوومان تێدەکات.

لە کۆتاییـدا دەڵێم ئاگاداربـە لە کۆتایی هەموو تونێلێکدا پرشـنگی خۆرو تاڵە زیوییە ڕووناکەکانـی بەدیـار دەکەون. سـەرچاوە/ ئینتەرنێت.

هێمن محەممەد عەلی



# کچ یان کوڕ!

زۆر جار کەسانێك دەبینین داوای کارێك لە کەسی بەرامبەر دەکەن، کە خۆیان توانای ئەنجامدانی ئەو کارەیان نییە، بەڵکو هەموو جیهانیش کۆببێتەوە ناتوانن ئەو کارە ئەنجام بدەن، وەك ئەوەی جاری وا هەیە پیاوێك داوا لە هاوسەرەکەی دەکاتو دەڵێت: دەبێت ئەمجارە کوڕت ببێت، ئەگەر نا...!

ئەوەی ئەم ڕووداوە ڕاستەقینەیەمان بۆ دەگێڕێتەوە، بە چاوی خۆی بینیویەتیو دەڵێت: ژنو پیاوێك هەبوون، پێنج کچیان هەبوو، بۆ جاری شەشەم پیاوەکە بە هاوسەرەکەی دەڵێت: ئەگەر ئەمجارەش کچت ببێت، دەبێت فڕێی بدەیتو خۆتی لێ ڕزگار بکەیت... منداڵی شەشەمیش لە دایك دەبێتو ئەمجارەش کچ دەبێت! بەڵام کچێکی زۆر جوانو ڕۆح سوك، پیاوەکە لە هاوسەرەکەی تووڕە دەبێت، وەك ئەوەی تاوانی هاوسەرەکەی بێت! بەڵام بێ ئاگایە لەوەی کە بە پێی زانستی پزیشکی کاتێك کە منداڵ کچ دەبێت تاوانی ئافرەتی هیچ تێدا نییەو ئەو کارە لە توانای ئەودا نییە، بە هەرحاڵ کۆرپە جوان کیلەکە دەپێچنەوەو لە پەنای مزگەوتێکدا دایدەنێت، بەو هیوایەی کەسێك بیباتەوە بۆ خۆی بەخێوی بکات، بۆ بەیانی دەبینێت کەس کۆرپەکەی هەڵنەگرتۆتەوەو هەر لە شوێنی خۆیدایە، باوکەکەش بەزەیی پێیدا دێتەوەو ناچار لەگەڵ خۆی دەیهێنێتەوە بۆماڵەوەو وەکو باقی منداڵەکانی تر بەخێوی دەکەن!

پاش ئەم ڕووداوە جارێکی تر هاوسەرەکەی منداڵی دەبێت، بەڵام ئەمجارە ویستی خودا وەها دەبێت کە کوڕیان ببێت، لەگەڵ لە دایك بوونی هەر کوڕێکیدا یەکێك لە کچەکانی دەمرێت، پێنج کوڕی دەبێتو لە بەرامبەریشدا پێنج کچی دەمرێت، تەنها ئەو کچەیان دەمێنێتەوە کە فڕێیانداو پاشان هێنایانەوە بۆ ماڵەوە.

کوڕەکان گەورە دەبنو هەریەکەیان ژن دەهێننو دەچن بە دوای ژیانی خۆیاندا، پاش ماوەیەك دایکی منداڵەکان دەمرێت، ئەوەی لە لای پیاوەکە دەمێنێتەوە تەنها کچە فڕێدراوەکەیەتی، ئەم کچە لەگەڵ ئەوەی زۆر شۆخو شەنگ دەبێتو خوێندن تەواو دەکاتو دەبێت بە مامۆستا، بەڵام خۆی بە قوربانی باوکی دەکاتو زۆر بە جوانی خزمەتی دەکات، لە سەروو هەموو ئەو کارانەشەوە خۆی بۆ خزمەتکردنی باوکی یەکلایی کردۆتەوەو بیرلەشووکردن ناکاتەوەو دەست بە ڕووی زۆرێك لە داخوازیکارانیدا دەنێت بۆ ئەوەی باوکی بێ خزمەت نەبێت، بە پێچەوانەی ئەم کچە دڵسۆزەشەوە براکانی بە دوو مانگ جارێك سەر لە باوکیان نادەن، ئا لەم کاتەدا باوکەکە پەنجەی خۆی دەگەزێتو پەشیمان دەبێتەوەو قوڵپەی گریانی لێ بەرز دەبێتەوەو بە ئاخو حەسرەتەوە دەڵێت: ئەمە ئەو کچەم بوو کە دەمویست خۆمی لێ دەرباز بکەمو فڕێی بدەم، خودایە زۆر پەشیمانم کوروکچ هەر خۆت دەیبەخشیتو هەر خۆشت دەیانبەیتەوە، خودایە بمبەخشە... خودایە بمبەخشە!

## وانەیەك بۆ ژیان

**ئێمە تەنها قسەی ئەو کەسانە**
**بە ڕاست دەزانین کە نایانناسین،**
**چونکە**
**پێشتر هەڵیان نەخەڵەتاندوین !!**

# ئایا پێکەنینی بێ هۆ هەیە؟

نەسیم سەمادی
سەرنووسەری (خلاصات - المختار الاداري - علاقات)

پەندێك هەیە دەڵێـــت: «پێکەنینی بێ هۆ لە کەمـــی ئەدەبەوەیە!!" دوێ شـــەو لەســـاتێکی بیرکردنەوەی ئیلهام بەخشدا بۆم دەرکەوت کە هیچ پێکەنینێك بێ هـــۆ نییە، تەنانەت کڵاو لەســـەرنانیش هۆکاری خـــۆی هەیە، وەکو لەم دوواییەدا رووی دا کاتێـــك کە هەندێك کەس توانیـــان بە زۆرێك لە خەڵکی رابوێرن‌و پارەو پولی دونیا لە شەوو رۆژێکدا بوو بە هەڵم.

بەرەبەیانـــی ئەمـــرۆ تەماشـــای شاشـــەکەمم دەکرد، کورەکەم داوای لێکردم سەرەتا هەواڵە ئابوورییەکانـــی بۆ بخوێنمـــەوە، لەبەرئەوەی لـــە بەرێوەبەرایەتـــی پاراســـتنی وەبەرهێنان کار دەکات لە یەکێك لە بانقەکاندا، منیش بە پێکەنینـــەوە پێم گوت: ئایا جگـــە لە هەواڵی ئابوری، هیچ هەواڵی تر هەس؟!

ئەمەش کورتەی هەواڵەکان:

هەواڵـــی یەکـــەم: بانقـــی (یو. بـــی. ئێس)ی سویسری (٧٥٠٠) کارمەند لەسەر کار دەردەکات بەمەبەستی کەمکردنەوەی زیانەکانی.

هەواڵی دووەم: چەتەکانی صۆماڵ چوار کەشتی تر دەفرێنن لە ماوەی یەك رۆژدا.

هەواڵی ســـێ یەم: ئابوری ناسانی چین دەڵێن: بازار کەوتووەتە ژێری ژێرەوە، گەشە پێدانیش دەستی پێکردووە، بەڵام....!

هەواڵی چوارەم: وڵ ستریت دابەزینی بەردەوامەو بە دوابەدوای ئەویش دا بازارەکانی ئاسیا جارێکی تر.

هەواڵی پێنجەم: هەزاران ئۆتۆمبیلی وەســـتاو لـــە بـــازاری ئوردندا کـــە نرخەکـــەی زیاد لە دوو ملیـــار دۆلارە. حکومـــەت گومرگەکـــەی دەگەرێنێتـــەوە بـــۆ هاوردەکارانـــی بۆ ئەوەی جارێکی تـــر هەناردەی بکەنـــەوە، بەڵام ( بۆ کوێی دەنێرنەوە، کێ لێیان دەکرێت؟ ئەصڵەن بۆچـــی لـــە بنەرەتدا بـــە بەهـــای دوو ملیار ئۆتۆمبیلی نوێ بێنینە ناو وڵاتەکەوە؟!).

هەواڵی شەشەم: پلانێك بۆ ئەپدێت‌و پەرەپێدانی پیشەســـازی میسری بە پێی مواسەفاتی جیهانی لەکاتێکـــدا پیشەســـازی جیهانـــی ئیفلاســـی کـــرد، بۆچی ئێمـــە بەپێـــی مواســـەفاتی ئەو، پیشەسازیەکانمان ئەپدێت بکەین؟.

هەواڵـــی حەوتـــەم: کۆمپانیـــای (ئـــەی. بی) کۆمپانیـــای (ســـکایبی) وەك کۆمپانیایەکـــی پشکدار دەخاتە بازارەوە بۆ ئەوەی زەرەرەکانی کەم بکاتـــەوە (قســـەیەکە مـــرۆڤ دەهێنێتە پێکەنین، کێ پشکەکانی دەکرێت؟).

هەواڵی هەشتەم: پرۆژەیەك بۆ پێدانی خۆراك بـــە منداڵانی گوندە هەژارەکان، ئەی منداڵانی شار، ئایا شارەکان لە گوندەکان هەژارتر نین؟!

هەواڵـــی نۆیەم: ژمـــارەی ئـــەو منداڵانەی کە بەشـــێوەیەی نایاســـایی کۆچیان کـــردووە بۆ ئەمریکا گەیشتووەتە (٤) ملیۆن منداڵ (چۆن دەژین، لەکوێ دەخوێنن، دەبێت رۆژێك لەوێ برۆن؟).

هەواڵـــی دەیـــەم: زیاد لـــە (٥٧) هـــەزار کتێب لە پێرســـتی (ئەمـــازۆن. کـــۆم) ون دەبێت لە هەفتەکانـــی رابردوودا، ئایا ئـــەوە هەڵەیەکی هونەرییە لەبەرنامەی نمایشکردنی کتێب دا؟ یا بە فیعلی فاعیلێك رووی داوە؟!

هەواڵی یانزەیـــەم: کۆمپانیایەك لە (أبوظبي) ٩,١٪ی پشـــکەکانی کۆمپانیـــای (مرســـیدس) دەکرێت: «هەواڵێکی جوانە، وا دەکات لە دڵەوە پێ بکەنین».

هەواڵی دوانزەیەم: داهاتی ئابووری دەوڵەتانی کەنـــداو دەگاتـــە دوو تریلیۆن ســـاڵی (٢٠٢٠) ئێمەش دەڵێین خوا دەیزانێ.

هەواڵـــەکان لـــە صۆماڵـــەوە بۆ سویســـرا، لە چینەوە بۆ ئەرجەنتین، فرمێســـکەکانمان پێ رۆ دەکات‌و مایەی بەزەیین.

هاوکات گریانیش هـــۆکاری خۆی هەیە... جیهان عەقڵی خۆی لە دەست داوە، چونکە ویژدانی لەدەســـت داوە، تەنها تەرکیزمان خســـتە ســـەرخانووبەرەو وێرانـــکاری‌و هەمـــوو ســـەروەتەکانمان لـــە چەنـــد کارێکـــدا وەبەرهێنا، بـــەڵام لە جەوهەری مرۆڤـــدا نەمانتوانـــی بەرهەمـــی بهێنین، هەریەکێکیش گومانی وابێت کە دەتوانێت بژیـــی بـــێ عەقڵ‌و بـــێ ویژدان، ئەوســـا هۆکارێکی دەســـت دەکەوێت بۆ پێکەنین‌و هەزار هۆکاریش بۆ گریان!!



# بریار بانگتان دەکات

وەرن با ژوانێک بۆ خۆزگەو ئاواتەکانمان ببەستین.
وەرن با هەموومان دیدی نیگاکانمان
رووەو یەک ئاراستە بنێرین!
چونکە ئەوە لوتکەی خۆشەویستی و ئەوینە!!
وەرن لە ژێر سایەی میهرو خۆشەویستی و دڵنیاییدا
دەستی داهێنان و گەشەپێدان و پێشکەوتنی یەکتر بگوشین!

وەرن با لەگەڵ بریاردا لە جیهانێکی ئەرخەوانیدا
ژیانێکی نوێ دەست پێ بکەین!
لە هەر بوارێکدا بەهرەمەندیت...
لە هەر بوارێکیشدا دەتەوێت بەهرەمەند بیت...
لەم پشووی هاوینەدا
سەردانی بریار بکەو ببە بە میوانی بریار
بۆ ئەوەی ببیتە خاوەنی بریار!

لەگەڵ بریاردا دەتوانیت بریار بدەیت!